چاپی شەشەم

# لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم



ئامادەکردن و وەرگێڕانی
ئەیاد فەهمی





# لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم

ئامادەکردن و بەکوردیکردنی
ئەیاد فەهمی



## ناسنامەی کتێب


❖ ناوی کتێب: لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم
❖ ئامادەکردنی: ئەیاد فەهمی
❖ پێداچوونەوەی: حەیدەر ئیبراهیم
❖ بابەت: کورتە ڕامان
❖ دیزاین: هونەر عوسمان
❖ قەبارە: ١٤*٢١سم
❖ ژمارەی لاپەڕە: ١٥٢ لاپەڕە
❖ نرخ: ٣٥٠٠ دینار
❖ نۆبەتی چاپ: چاپی شەشەم/٢٠٢٢
❖ شوێنی چاپ: ناوەندی سارا- سلێمانی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردن(      )ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە




**ناوەندی سارا**

**بۆ چاپ و بلاوکردنەوە**

**سلێمانی_بازاڕی ئاوباریك_ نهۆمی دووەم_ بەرامبەر کاسۆمۆڵ**

## ئەگەر ویستت......

ئەم کتێبە باسی خودا و میهر و لێخۆشبوونی دەکات، پێم باش نییە، لە یەک دانیشتندا یان دوو دانیشتندا بیخوێنیتەوە، هەرچەندە قەبارەکەی وا دەخوازێت، بەڵکوو پێم باشە بە چەندین دانیشتن بە چەند ڕۆژێکی زۆر بخوێنرێتەوە! وەک خواردنێک نییە بە یەکجار بخورێت، بەڵکوو وەک دەرمان وایە، بەسوود نابێت ئیللا لە چەند ڕۆژێکدا نەبێت و، بە چەند جارێک نەبێت.......

## پێشەکیی وەرگێڕ

خوێنەری بەڕێز، ئەم کتێبەی بەردەستت بریتیە لە کۆمەڵێک کورتە ڕامان، کە باسی میهری خودا و لێخۆشبوونی دەکات، هانت دەدات نزا بکەیت و ئومێدت هەبێت بە وەڵامدانەوە، بێئومێد نەبیت لە ژیان و هەمیشە و بەردەوام بگەڕێتەوە بۆ لای خودا، سکاڵای خەمەکانت لەلای ئەو زاتە بکەیت و نهێنی و ڕازەکانت تەنها لەلای ئەو بدرکێنیت، لە ڕێی ئەم کورتە ڕامانانەوە بۆت دەردەکەوێت هەتا چ ئەندازەیەک پەروەرێنت میهرەبانە بەرانبەرت، چاکە دەهێنتە ڕێت و خراپەت لێدووردەخاتەوە، لە خۆت باشتر کارەکانیشت بۆ بەڕێوە دەبات.

کورتە ڕامانەکان ڕۆژانە وەرگێڕانم بۆیان کردووە، دواتر پێم باشبوو کۆیانبکەمەوە و لەگەڵ چەندین گوتەی تردا لە دوو تویێ کتێبێکدا کۆیانبکەمەوە هەتا سوودی بۆ زۆرترین خوێنەر هەبێت.

ئەو وتانەی ناوی نووسەرەکەیم زانیووە، نووسیومە، ئەوانەشی بێ ناو بوون، وەک خۆی وتەکەم داناوەتەوە، واتە بە ئەنقەست ناوی هیچ نووسەرێکم لانەداوە....

وەک ئەمانەتیی گواستنەوەش بەشێکی باشی ئەم کتێبە ئەو کورتە وتانەیە کە (ئەدهەم شەرقاوی) ڕۆژانە لە واڵی خۆی دایناون. واتە ئەوەی لەم کتێبەدا نووسینی خۆمە تەنها ئەم پێشەکیەیە، ئەوەی تری تەنها وەرگێڕانم بۆیان کردووە، بۆیە هەر وتەیەکت لەم کتێبە دەرهێنا و بڵاوت کردەوە، ئەوا ئاماژە بە ناوی کتێب و وەرگێڕ بدە،

واتە بنووسرێت لە کتێبی لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم، لە وەرگێڕانی ئەیاد فەهمی وەرگیراوە، نەک نووسینی ئەیاد فەهمی......

ئەم کتێبە دیارییەکی بچووکە بۆ خوێنەرەکانم، بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی هەمیشە هاوکاریم دەکەن، جا بە دەستخۆشی بێت یان نزایەک لە پەنهانیدا، هانیان داوم بەردەوام بم لە کاری وەرگێڕان، هیوادارم دیارییەکی بەپێز و بەچێژ و سوو بەخش بێت بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی دەیخوێننەوە، لەدوای خوێندنەوەی شوێنەوارێکی جوان و گەش جێبهێڵێت تێیاندا.

**ئەیاد فەهمی سەنگاوی**

(١)

ئەو دەمەی بەڕێیەکدا دەڕۆیت و نووسراوە:
چوونە پێشەوە قەدەغەیە... کێڵگەی مینە.
لەم کاتەدا، سوپاسی ئەو کەسە دەکەیت کە ئەمەی نووسیووە.
ناڵێیت ئەم کەسە ئازادییەکانمی سنووردار کردووە،
بەڵکوو دەڵێیت سەلامەتی پاراستوومە.
سنوورەکانی خودا و قەدەغەکراوەکانیشی بەم شێوەیەن
ئازادییەکانت سنوور دار ناکەن، بەڵکوو سەلامەتیت دەپارێزن.
خودا فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾
واتە: ئەوەی سنورەکانم ببەزێنێت، ستەمی لە خۆی کردووە.

***

(٢)

"زۆرم لە خودا داواکرد و لێی گرتمەوە، گرتنەوەکەی لوتکەی بەخشین بوو، فێربووم ئەوە داوا بکەم کە دەمەوێت، ڕازی بم بەوەی دەیەوێت، بەردەوام ویستی ئەو بەرەو چاکەی دەبردم، ویستی خۆیشم بەرەو خراپەی دەبردم، هەتا ئێستاش دەستم دەگرێت بەرەو چاکە، ئیدی خاترجەم بووم خودا لە هەمووان میهرەبانترە!"

موستەفا مەحموود

(٣)

﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا﴾ سوورەتی نوح ١٠
وتراوە: زۆر بیر مەکەرەوە، بەڵکوو زۆر (أستغفرالله) بکە،
چونکە خودا بەو وتەیە، هەندێ دەرگات لێدەکاتەوە
کە بە بیرکردنەوە لێت ناکاتەوە....

ئیبنو تەیمییە فەرموویەتی:
هەرکارێک بەڕوومدا داخرابێت
هەزار جار (أستغفرالله)م کردووە،
کارەکە بەڕوومدا کراوەتەوە.

***

(٤)

زەکەریا ئێسکەکانی پووکابوونەوە

مووەکانی سپی بووبون و

خێزانەکەی منداڵی نەدەبوو.

دەستی بەرزکردەوە فەرمووی:

﴿ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾

واتە: خودایە بە تەنیا جێم مەهێڵە، تۆ چاکترین میراتگرانیت.

وەڵامی درایەوە بە: ﴿فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ ﴾

واتە: وەڵاممان دایەوە و یەحیامان پێ بەخشی.

**هەرکەس دڵی وابەستەی هۆکارەکان بکات،**

**خودا دەیداتە دەستی هۆکارەکان**

**هەرکەسێکیش دڵی وابەستەی خودا بکات**

**خودا هۆکارەکانی بۆ ئاسان دەکات.**

* * *

(٥)

گەر نوێژی بەیانیت دەچێت
نوێژی چێشتەنگاو بکە!

گەر نوێژێکی فەرزت لەدەست چوو
ئەو ڕۆژە نوێژی سوننەت زۆر بکە!

گەر بە ڕۆژ تاوانێکت ئەنجامدا،
هەوڵبدە شەوەکەی شەونوێژ بکەیت!

گەر زیکرەکانت لەدەست چوو
هەوڵبدە دوو لاپەڕە قورئان بخوێنیت!

تاوانت کرد، بە چاکە کردن بیسڕەوە
**هەرگیز پەیوەندی نێوان خۆت و خودا مەبچڕێنە!**

(٦)

موسا دەگریا، دەنگی گریانەکەی کۆشکی پڕکردبوو،
شیری هیچ دایەنێکی نەدەخوارد.
فیرعەون و ئاسیا، دایەنەکان و پاسەوانانی کۆشک.
هەموو ئەمانە تەنها لەبەر یەک شت بوون، لەبەر ئەو بەڵێنە بوو کە خودا
لە نزیک ڕووبارەکە بە دایکە بەسۆزەکەی دا:
﴿ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ ﴾ سوورەتی القصص٧
واتە: ئێمە بۆت دەگەڕێنینەوە.

**متمانەت بە خودای خۆت هەبێت،**
**کێ لە خودا بەوەفاترە لە بەجێهێنانی بەڵێندا !**
**﴿وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ﴾ سوورەتی تەوبە١١١**

***

(٧)

هەروا بە هەوانتەی نەبووە، لە سکی دایکتدا بووی ڕۆزیی و تەمەنت دیاری کراوە، خودا دەیەوێت بەسەر بەرزیەوە بژیت، بۆ پارویەک نان نەبیت بە کۆیلە.

ئەوەی هیی تۆ بێت هەموو جیهان ڕێگری بکەن، هەر پێت دەگات.
هەموو جیهان کۆببنەوە بۆ لەناوبردنت، ناتوانن ساتێک لە تەمەنت ببەن.

فەرموودەی خودات نەخوێندۆتەوە،
﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾ سوورەتی تەوبە٥١
واتە: هیچ شتێکمان توش نابێت مەگەر خودا بۆی نووسیبین.

***

(٨)

درەنگ وەڵامت دەداتەوە
هۆکارەکەی ئەوەیە هێشتا ماوتە پێی بگەیت.

لەبەرئەوەی دڵت ڕەقییەکی تێدایە،
خودا دەیەوێت تەواو نەرمی بکات.

درەنگ وەڵامت دەداتەوە،
لەبەرئەوەی زۆر بە خۆت سەرسام بوویت،
وا بیرت دەکردەوە لەوانی تر باشتریت.

***

(٩)

نهێنیەکانت بە کەس مەڵێ!
هەندێکیان تاوان
هەندێکی هەڵە
هەندێکی تریان پێخلیسکانە
تەمەن دەڕوات و لەبیرت دەچنەوە
خوداش لێت خۆشدەبێت،
بەڵام لە هزری خەڵکیدا هەر زیندووە،
باسی دەکەن، بیرت دەخەنەوە..

هەندێک باسی دەکەن، هەتا هەڵەکانی خۆیانی پێ دابپۆشن،
هەندێکی تر لەبەر ئەوە باسی دەکەن،
چونکە پێیان ناخۆشە بەرەو باشتر هەنگاوت ناوە.

**بیرت بێت، ئەوە تەنها خودایە چاکەی تۆی دەوێت.**

(١٠)

وا گومان مەبە خودا وەڵامی نزاکانت ناداتەوە
خودا بیسەری نزاکانتە،
کارەکانت بەڕێوەدەبات،
هەموو چاکەیەک دەهێنێتە ڕێت
هەموو خراپەیەکت لێ دووردەخاتەوە
دڵنیابـە خودا لەیادت ناکات.

"عەلی تەنتاوی"

***

(١١)

تاقیـ بکەرەوە، بە هەمان خێرایی خوێندنی سورەتی فاتیحە لە نوێژدا لەگەڵ خەڵکیدا بدوێیت، دواتر بڕوانە کاردانەوەیـان......
ئینجا بزانە تۆ ئاوا لەگەڵ خودادا دەدوێیت.

(١٢)

ئەمە سورەتی کەهفە

کەشتیەی کون نەکردایە، لەناو دەبرا.

**"خودا بە بەڵای بچووک، بەڵای گەورەترت لەسەر لادەدات."**

منداڵەکە لە ناو نەبرایە، ئازاری دایک و باوکی دەدا.

**" گرتنەوەی خودا بەخشینە!"**

دیوارەکە ڕاست نەکرایەتەوە، ماڵی بێباوکەکان دەخورا.

**" بنوارە، میهرەبانی خودا !"**

لەگەڵ هەر کەوتنێک،

لەگەڵ هەر لەدەستدانێک

لەگەڵ هەر نیعمەتێکدا

بێژە:

پەروەردگارا ئارامیم پێ ببەخشە

لەسەر ئەو شتنانەی من لە حیکمەتەکەی نازانم.

(١٣)

خودا کارەکانی یوسف پێغەمبەری بەڕێوەبرد.
لە سارادا، کاروانییەکانی پێویست بە ئاو کرد
بۆ ئەوەی لە بیرەکە دەری بهێنن.

دواتر عەزیزی میسری پێویست بە منداڵ کرد
بۆ ئەوەی یوسف بەخێوبکەن.

دواتر پاشای پێویست بە خەوزانێک کرد
بۆ ئەوەی لە زیندان ڕزگاری بکەن.

دواتر هەموو میسری پێویست بە خواردن کرد
بۆ ئەوەی بکرێتە عەزیزی میسر.

کە خودا کارەکانتی بەڕێوەبرد،
هەموو هۆکارەکانی خۆشبەختیت بۆ ئاسان دەکات
لە کاتێکدا ئاگات لە هیچ نییە.

**خۆت و کارەکانت بسپێرە بە خودا......**

(١٤)

شوشە عەترەکەم کە زۆرم خۆشدەویست، لە دەستم کەوتە خوارەوە و شکا! زۆر پێی بێتاقەت بووم، بەڵام بەدرێژایی ڕۆژەکە کە دەچوومە ژوورەوە، بۆنێکی زۆر خۆشدەهات، پێشتر بۆنی ئەم عەترە ئاوا بڵاونەدەبوویەوە. بۆم دەرکەوت دەبوایە بشکایە، هەتا ئاوا بۆنەکەی بە تەواوی ژوورەکەدا بڵاوبێتەوە.

لەوەیە دڵت شکا بێت، یان شتێک هەبێت لە دڵتدا کە پێی شکا بێت، لێ لەوە دڵنیابە ئەم شکانە بۆ ئەوە بووە، هەتا شتێکی جوانی شارەوە لە ناختدا بەدەربخات، بۆ ئەوەی ئەزموونێکی تازەت نیشانبدات، مێشکت فراوان بکات و چۆنیەتی بیرکردنەوەت بگۆڕێت.

**هەر بۆیە گەر شکایت، خەمبار مەبە!**
**خودا دەیەوێت باشتر و جوانتر بدرەوشێیتەوە.**

(١٥)

ئەو دەمەی خەم و کێشەکانت دنیات لێ بچوک دەکەنەوە،
دەبینیت خەونەکانت نایەنە دی،
دەبینیت پەیتا پەیتا دەکەویت، دەڕوخێیت،
دەزانیت ئەو ڕێگایەی گرتوتە بەر بەرەو سەرکەوتن نابات.

ئەوا لەسەر ئەژنۆ دابنیشە و ڕوو لە قیبلە بکە،
دەستەکانت بەرزبکەرەوە بەرەو خاوەنی زەوی و ئاسمانەکان
بەدیهێنەری خەون و ئاواتەکانت.
بە دڵێکی پڕ ئومێد و هیواوە داوای لێبکە
ئاوات و خەونەکانت بەدی بهێنێت
ژیانێکی خۆش بهێنێتە ڕێت
بەهێزت بکات بەرانبەر ناڕەحەتیەکان.

**تۆ پێویستت بەوەیە ئافرێنەری ئەم گەردوونە پشتیوانت بێت.**
**ئەو ئاگای لە تۆیە، دەزانێت سوودی تۆ لە چی دایە.**
**دەزانێت چ سوودی هەیە بۆت، و چ شتێک زیانی بۆت هەیە.**

(١٦)

ئیمامی نەوەوی وانەی بە خوێندکارەکانی دەوتەوە، گەیشت بە ئایەتی ﴿۞نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ﴾
واتە: هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە بەڕاستی هەر من لێبوردەی میهرەبانم و، بێگومان هەر سزای منە سزای سەخت.

لەم کاتەدا زۆر گریا.

لێیان پرسی مامۆستا بۆچی دەگریت؟
فەرمووی: تەماشای میهرەبانی خودا بکەن، لێخۆشبوون و میهرەبانیەتی داوەتە پاڵ خۆی، بەڵام سزای نەداوەتەوە پاڵ خۆی بەڵکوو فەرموویەتی:
وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ
فەرموویەتی سزاکەم، نەیفەرمووە من سزادەرم.

وتەکەی ئیبنو عەباسم بیرکەوتەوە، کە دەفەرموێت:
لە ڕۆژی دوایدا هێندە میهرەبانی خودا دادەبەزێت،
شەیتانیش واگومان دەبات خودا لێی خۆشدەبێت.

(١٧)

ئاگای لێتە لەم دەرگا دەدەیت، دەڕۆیت بۆ ئەو دەرگا.
سەرناکەویت، ماندوویت، خەمباریت.
ئەم سەرکۆنەت دەکات، ئەو بێزارت دەکات.
تۆش خەمبار دەبیت، دەگریت، دەکەویت، هەڵدەسیتەوە
دواتر هیچ پەناگەیەک شک نابەیت پەنای ئەو نەبێت.

بە شەرمەزارییەوە، بە گریانەوە، بە پەشیمانییەوە
دەچیتەوە بەر دەرگاکەی.
ئەویش پێشوازیت لێدەکات، وەک ئەوەی بفەرموێت:
گەر لەگەڵت سارد بوون، ئەوا منت هەیە!
گەر ئازاریان دایت، من دکتۆری تۆم!
بەخێرهاتیتەوە، بەخێرهاتیتەوە،
بەخێرهاتیتەوە بۆلام بەندەکەم.
بۆ سکاڵا دەبەیتە لای کەسانی تر
کە هەر من نارەحەتیت لەسەر لادەبەم
بەندەکەم بانگم بکە.......وەڵامت دەدەمەوە

**من لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم.......**

(١٨)

کابرای دەشتەکی بە دەووری کەعبەدا دەسوڕایەوە

پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد.

لێیان پرسی، هیچ پێویستییەکت بە خودا هەیە؟

وتی: نەخێر......بەڵکوو داوایەکم هەبوو ئەوەم وت.

پرسیان؛ چیت وت؟

وتی: **وتم پەروەردگارا، هەموو تاوانەکانم لای تۆ تۆمارکراون لێم خۆش بە، هەموو پێویستەکانم دەزانیت بۆم جێبەجێ بکە!**

***

(١٩)

لە ساڵی ڕابردوودا ڕۆژنامەی ( جون أفریک ) ڕایگەیاند،
کتێبی " الأربعین النوویة" لەنێو هەموو کتێبەکاندا،
زۆرترین فرۆشی هەبووە لە فەڕەنسادا!
ئیمامی نەوەوی هەرگیز بەبیریدا نەدەهات،
کە چاکە و خێری لە شەقامەکانی پاریسدا هەبێت.
بۆ هەموو ئەوانەی بە شوێن ناوبانگ و خۆدەرخستنەوەن:
**دڵنیابن ئەوەی بۆ خودا بێت، دەگات و بەردەوام دەبێت.**
**ئەوە کارەشی بۆ خودا نەبێت، ناگات و لەناودەچێت .**

"ئەدهەم شەرقاوی"

***

(٢٠)

خودا زۆر ناڕەحەتیت لێ دووردەخاتەوە لە ڕێگەی:

- لە کار کەوتنی ترۆمبێلەکەت.
- درەنگ لە خەوهەڵسانت.
- ناساغبووت.
- میوانێکت دێت و کارێکی گرنگت هەیە.
- ڕازی نەبوونی کەسێک کە ببێتە هاوسەری ژیانت.
- درەنگ کەوتنی بوون بە باوک.
- دەرکردنت لە کارەکەت.

ئێمە ئەم کارانە بەڕووی خراپ سەیر دەکەین،
ناڕازین لێی و ڕەخنە دەگرین، لەبری ئەوەی شوکرانەی خودا بکەین.

بیرت بێت، ئەگەر ئاگامان لێبوایە خودا چۆن کارەکانمان بەڕێوە دەبات، سوجدەی شوکرمان دەبرد، لەپای ئەوەی ئاوا کارەکانمان ئاوا بەڕێوە دەبات.

(٢١)

تاقیت دەکاتەوە بە لەدەستدانی کەسەکان
بۆ ئەوەی بزانیت، ئەوە تەنها خودایە دەمێنێتەوە!

تاقیت دەکاتەوە بە کەوتن،
بۆ ئەوەی بزانیت، ئەوە تەنها خودایە ڕاستت دەکاتەوە!

تاقیت دەکاتەوە بە فیڵی خۆشەویستانت
بۆ ئەوەی بزانیت، ئەوە تەنها خودایە جێی ئارامی و دڵنیاییە.

**تاقیکردنەوە و ناخۆشییەکان بۆ تۆڵەکردنەوە نیە لە تۆ،**
**بەڵکوو بۆ پەروەردەکردنت و ڕاستکردنەوەی ڕێگاکەتە.**

***

(٢٢)

ئەوکاتەی تەواو دڵنیایت کە خودای گەورە
ناخۆشییەکانت دەگۆڕێت بە بەختەوەری،
فرمێسکەکانت دەگۆڕێت بە زەردەخەنە،
ئەوا پەرستشێکی زۆر گەورەت ئەنجامداوە،
ئەویش گومانی باش بردنە بە خودای خۆت.

***

(٢٣)

یوسفی ڕاستگۆ لەگەڵ دوو لاوی تردا لە زینداندا بوون،
یوسف بە دڵ و ڕووکەش لە ئەوان جوانتر بوو.

بەڵام خودا پێش یوسف دوو لاوەکەی لە زیندان ئازاد کرد،
یوسف دوای ئەوان بە چەند ساڵێک لە زیندان مایەوە.

یەکەمیان بووە خزمەتکار، دووەمیش لە خاچ درا،

یوسف بە ماوەیەکی زۆر دوای ئەوان ئازادکرا،
بۆ ئەوەی ببێتە عەزیزی میسر.

**خودا بەدیهێنانی ئاوات و خولیاکانت دوا دەخات،**
**بۆ ئەوەی زیاتر و زۆرترت پێ ببەخشێت!**

(٢٤)

ئەو دەمەی منداڵبووم
دایکم پێی وتم:
خودا تۆی خۆشدەوێت
حەزدەکات لە سوژدەدا ناوچاوانت ماچ بکات.
زۆر لە سوژدەدا دەمامەوە و دەمچرپاند:
منیش تۆم بەو ئەندازەیە خۆشدەوێت.

***

(٢٥)

تەنها بە یەک دوعای پێغەمبەر نوح
خودا زەوی ژێر ئاو خست.
﴿ رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾ سورەتی نوح٢٦
واتە: پەروەردگارا مەهێڵە لەسەر زەوی هیچ کەسێک لە بێ بڕوایان.

تەنها بە یەک دوعا، زەکەریا خێزانی چاکبووەوە و منداڵی بوو.
﴿ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدًا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴾ سورەتی الانبیاء ٨٩
واتە: پەروەردگارم بە تەنها مەمهێڵەرەوە، تۆ چاکترین میراتگرانیت.

تەنها بە یەک دوعا، ناوسکی نەهەنگ بووە پەناگە بۆ یونس.
﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾
واتە: خودایە هیچ پەرستراوێک نییە جگە لە تۆ پاکی و، بێگەردی بۆ تۆیە، بێگومان من لە ستەمکاران بووم.

تەنها بە یەک دوعای ئیبراهیم
مەککە وای لێهات لە هەموو جیهانەوە ڕووی تێبکرێت.
﴿ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ ﴾ سورەتی ابراهیم ٣٧
واتە: دڵی خەڵکانێ وا لێبکەیت سۆزیان ببێ بۆ لایان.

**دڵنیابە دوعا، تەواوی شتە تێکچووەکانت بۆ ڕێک دەخاتەوە.**

(٢٦)

لە یاساکانی خودا لەسەر زەوی

① ئەو سەرەتایەی خودا پێی ڕازی نییە
کۆتاییەکەی خاوەنەکەشی ڕازی ناکات.

② لەبەر خاتری خۆشەویستانت، سەرپێچی خودا مەکە،
دڵی خۆشەویستانت لەژێر دەسەڵاتی خودادایە.

③ لەلایەن ئەو کەسانەوە شەرمەزاری دێتە ڕێت
کە لەپێناویاندا سەرپێچی خودات کردووە.

④ ئەوەی لە خودا ترسا، لە هیچ شتێک ناترسێت.
ئەوەی لە خودا نەترسا، لە هەموو شتێک دەترسێت.

(٢٧)

خودا بەهەرشتێک تاقیکردیتەوە

ئەوشتە خێری تێدایە بۆت، با گومانیش ببەیت کە وانییە...

- بیرکردنی کەسێک.
- جیابوونەوە لێی.
- نەخۆش کەوتنت.
- مردنی ئازیزانت.
- هەموو ئەوشتانە فرمێسکت پێ دەڕێژن.

هەموو ئەمانە تاقیکردنەوەیە.

بیری بەڵێنەکەی خودات بێت و دڵنەوایی خۆتی پێبکە:

وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ

واتە: سوێند بە خوا تاقیتان دەکەینەوە بە هەندێک لە ترس و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و دارایی و خەڵکی و بەرووبوووم، جا مژدە بدە بە خۆڕاگران.

(٢٨)

ئەو دەمەی موسا چووە مەدیەن،
خانووی نەبوو، کاری نەبوو، خێزانیشی نەبوو.

کارێکی چاکەی کرد و چووە سێبەری درەختێک و فەرمووی:
﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾ سوورەتی القصص ٢٤
واتە: پەروەردگارا بەڕاستی تۆ خێرو بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم.

خۆری ئەو ڕۆژە ئاوا نەبوو،
هەتا بووە خاوەنی ماڵ و کار و خێزان.

**هەربۆیە تۆش لەدوای ئەنجامدانی هەموو کارێکی چاکە،**
**ئەم دوعایە بکە ﴿ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ ﴾**

(٢٩)

﴿قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾

واتە: یەعقوب فەرموی من باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خوا دەکەم، من لەلایەن خوداوە شتانێک دەزانم کە ئێوە نایزانن.

یەعقوب لە سوجدەدا دەیفەرموو:
پەروەردگارا ڕەحم بە لاوازیەکەم ناکەیت،
ڕەحم بە پیرییەکەم ناکەیت،
ڕەحم بە مووە سپیەکانم ناکەیت و
ڕەحم بە ملکەچیەکەم ناکەیت.
خودا فەرمووی:
"سوێند بەهێز و توانام، ئەگەر یوسف مردووش بوایە بۆم زیندوو دەکردیتەوە، ڕۆژی دواتر مژدەی گەڕانەوەی یوسفی پێ گەیشت"

(٣٠)

ڕەنگە ئێستا خەمبار بیت،
زۆر دەمێکە چاوەڕێ بیت ئاواتەکەت بێتە دی،
بەڵام هێشتا چاوەڕوانیت و نەهاتۆتە دی.

لەوەیە وەڵامی ئەو دوعایەنەت نەدرابێتەوە،
کە بە دڵێکی پاکەوە، بە ڕاستگۆییەوە، بە ئیلحاحەوە کردووتن.

ڕەنگە ئەمشەو بخەویت و دڵت پڕبن لە خەمانێک
کە تەنها خودا ئاگای لێیانە، ناتوانیت بۆ کەسی باس بکەیت،
بە هیچ کەسێکی ئەم جیهانە ئارام نابیتەوە.

پێت دەڵێم ڕۆژێکی جوان چاوەڕێتە!
ئومێد و هیوا دەگەڕێنەوە ناو دڵەکەت!
نزا جوانەکانت وەردەگیرێن!
بەمەش خودا ئیمانەکەت نوێ دەکاتەوە!
متمانەت بە خودای خۆت نوێ دەبێتەوە!
دڵنەوایت دەکەم بەو وتەی کە پێغەمبەری خودا
هاوەڵی ئەشکەوتەکەی پێ ئارام دەکردەوە ﴿ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴾

(٣١)

هەر کاتێک کە تاوانێک ئەنجامدا،
بە نەفسی خۆت بڵێ:
هێشتا جەنگەکەم نەدۆڕاندووە !
بێئومێد مەبە،
بە دەستنوێژ گرتنێک و دوو ڕکات نوێژ، خۆت بونیاد بنێرەوە!
بەو پەنجانەی تاوانەکەت پێکردووە، یادی خودای پێ بکە!
بەو چاوانەی حەرامت پێ دیووە، قورئان بخوێنە!

**خاترجەم بە،**
**گریانی تۆبەکاران لای خودا، وەک موناجاتی پیاو چاکان وایە.**

داوای لێخۆشبونی لێبکە، بۆیە ناوی خۆی ناوە (الغفور)، دەیەوێت هەرکاتێ گەڕایتەوە بۆلای لێت خۆش ببێت.
﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴾ سوورەتی نوح ١٠

(٣٢)

لە پێشەوا شافعییان پرسی:
چ کردەوەیەک زۆر لە خودا نزیکمان دەکاتەوە؟
دەستی کردە گریان و، فەرمووی:
خودا لە دڵت بڕوانێت،
ببینێت لە دنیا و قیامەتدا هیـچت ناوێت جگە لە خودا.

***

(٣٣)

﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ﴾ سوورەتی الزمر ٣٦
واتە: ئایە خودا بەس نیە بۆ بەندەکەی.

ئای ئەم ئایەتە چەندێ ئارامم دەکاتەوە!
چەندێ هەست بە گەورەیی و میهرەبانی خودا دەکەم تیایدا!!

بەوانە دەڵێم: کە خەفەت و کێشە چواردەووری داون،
بە هەموو ئەوانە دەڵێم: کە ستەمیان لێکراوە،
بە هەموو ئەوانە دەڵێم: کە ژیان تەواو ماندووی کردوون،
بە هەموو ئەوانە دەڵێم: کە خۆشەویستانیان جێیان هێشتووە،
بە هەموو ئەوانە دەڵێم: کە تەنیان، هەژارن، نەخۆشن.....
﴿أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ﴾

(٣٤)

گومانی چی بە خودایەک دەبەیت،
میهرەبانیەکەی پێش سزاکەی کەوتوە.
گومانی چی بە خودایەک دەبەیت،
میهرەبانیەکەی هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

گومانی چی بە خودایەک دەبەیت،
لە ئافرەتێکی داوێنتەڕ خۆشبوو بەهۆی ئاودان بە سەگێکەوە.
گومانی چی بە خودایەک دەبەیت،
بەندەکانی خۆشدەوێت و هەرچەندە بێ پێویستە لێیان.

گومانی چی بە خودایەک دەبەیت، بە گەڕانەوەت دڵخۆشە
وەلامت دەداتەوە، خەمەکانت دەڕەوێنێتەوە.
گومانی چی بە خودایەک دەبەیت، شەوانە دێتە ئاسمانی دنیا
بانگت دەکات بۆ ئەوەی لێت خۆشبێت، ئاواتەکانت بهێنێتە دی.

گومانی چی بە خودایەک دەبەیت، **میهرەبانە، ئارام گرە، لێخۆشبووە.**

(٣٥)

ئەو دەستەی بەرزدەکرێتەوە بەرەو لای خودا
مەحاڵە بە بەتاڵی بگەڕێتەوە.

***

(٣٦)

بیر لە سەختی ئێستات مەکەرەوە،
بەڵکوو بیر لە بەهێزی و توانای ئەو زاتە بکەوە کە داوای لێدەکەیت.
هەر کارێکت لەسەر گرانبوو، بیری وتەی پەروەردگارت بێت
﴿ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ﴾ واتە: ئەوکارە بۆ ئێمە ئاسانە.......

(٣٧)

خودا هەر نیعمەتێک برژێنێتە سەر هەرکەسێکدا،
هیچ کەس ناتواتێ ڕێگری لێبکات.
بە ئارامی و بەختەوەرییەوە بژی
دڵنیابە کە خودا دەرگایەکی بەڕووتدا کردەوە،
هیچ کەس ناتوانێت دایبخات.

***

(٣٨)

ئەگەر خودا بیویستایە تۆ ڕەق بیت
بە بەرد دەیئافراندیت،
بەڵام نەرمی قوڕەکەت بەمەبەست بووە.

(٣٩)

خودا خەمی تۆیەتی، کە لەناو تاریکی خودی خۆتدا غەرق ببیت، هەر بۆیە بە بەلا و نەخۆشییەکان ئاگادارت دەکاتەوە.

***

(٤٠)

خودا ئاگای لە گفتوگۆکەت بوو لەگەڵ دەروونتدا
کە پێت دەوت: ئارام بە، خودا هەموو شتێک باش دەکات!
واگومان دەبەیت خودا شەرمەزارت بکات!

***

(٤١)

**خودا لە هەزاران دڵسۆز و پەناگە بەسۆزترە بۆت!**
**هەر خودا دەمێنێتەوە، ئەو دەمەی هەمووان جێت دەهێڵن.**

***

(٤٢)

پەروەردگارا هەڵەدەکەم بەڵام خۆشمدەوێیت!
دەزانم کردەوەکانم ڕەنگدانەوەی خۆشەویستی تۆی تێدا نییە،
بەڵام تۆ خودایت، تۆ گەورەیت، تۆ پەناگەمانیت،
بۆلای کێ بچین بێجگە لە تۆ!
بمگەڕێنەوە بۆلای خۆت، بە جوانترین گەڕانەوە!

***

(٤٣)

دانی پێدادەنێم خودا لەوە زیاتری پێبەخشیووم کە شایستەیم،
لە هەوڵەکانم زیاتر ڕێزی لێناوم!
زۆر لەوە زیاتر لەگەڵمدا بووە کە من لەگەڵیدا بووم!
هەرچەندە دووربووم وازی لێ نەهێناوم!
هەرچەندە کەمتەرخەم بووم شەرمەزاری نەکردم بەرانبەر گومانە جوانەکەم پێی!
لە دڵی چواردەورەکەمدا خۆشەویستی کردم سەرەڕای کەمتەرخەمی و تاوانەکانم. دانی پێدادەنێم کە هەتا هەتایە شوکرانەی بکەم، هێشتا بە تەواوەتی حەقیم نەداوەتەوە.

***

(٤٤)

هەرگیز مەرج نەبووە لە چوونت بەرەو لای خودا
وەک فریشتـەکان پاک و بێتاوان بیت.
بە تەواوی تاوان و کەم و کورتیەکانتەوە بەرەولای خودا بچۆ،
خودا پێی خۆشە گەر بە گاولێکش بێت، بەرەو لای بچیت.

***

(٤٥)

لە دوای تێپەڕبوونی کاتێکی زۆر
دەگەیت بەو شتەی لە خودات داواکردبوو.
لەوەیە بیرت چووبێتەوە
بەڵام خودا لە بیری نەچووەتەوە ......

"موحەممەد متوەلی شەعراوی"

(٤٦)

ئەوکاتەی خەمەکانت بۆ مرۆڤەکان باس دەکەیت
لە کۆتاییدا دەڵێن: خودا یارمەتیت بدات.
بۆیە فێربە، هەر لەسەرەتاوە
خەمەکانت بۆ ئەو زاتە باس بکەیت کە یارمەتیت دەدات.

***

(٤٧)

نیگەران مەبە، گەر خەفەت و ئازارەکان تەواو ماندوویان کردیت!
نیگەران مەبە، گەر ئەم دنیا فراوانەت لەلا تەنگ بوویەوە!
لەوەیە خودا حەزیکردبێت
گوێبیستی دەنگت بێت لە کاتێکدا داوای لێدەکەیت.

(٤٨)

سوپاس یوسفی ڕاستگۆ،

لە چیرۆکەکەت فێری ئەوە بووم، سکاڵام تەنها ببەمە لای خودا.

خەم و کێشەکانم هەر لای ئەو باس بکەم.

خەڵکی خۆشیان دەوێیت، یان ڕقیان لێتە،

ئەوەی تۆی خۆشدەوێت بۆت خەمبار دەبێت!

ئەوەی ڕقی لێتە، خۆشحاڵە کە خەمباریت!

بەڵام هەردووکیان هیچیان پێ ناکرێت بۆت!

دەی بۆچی سکاڵای خۆم نەبەمە لای زاتێک کە هەموو کارەکانم بە دەستی ئەوە!

"ئەدهەم شەرقاوی"

***

(٤٩)

ئەوە تەنها خودایە گوێت بۆ دەگرێت.
لە ناوەڕاستی تاریکیدا دەتبینێت!
ئەوەی ژیان لێی بردووی دەتداتەوە، خەمبارمەبە!

***

(٥٠)

ئەو دەمەی هەست دەکەیت هەموو دەرگاکان بەڕووتدا داخراون، میهرەبانی خودا لە دەرگای مەحاڵەوە پێت دەگات، لەگەڵ خودا بە و نیگەرانی هیچ شتێک مەبە!

***

(٥١)

لە خودا بپاڕێوە، نەک بۆ ئەوەی داوای شتێکی لێ بکەیت، بەڵکوو بۆ ئەوەی سوپاسی بکەیت لەسەر ئەو نیعمەتە بێ شوومارەی پێی بەخشیویت.

(٥٢)

ئەو خودایەی ڕۆژهەڵات هەتا ڕۆژئاوا ڕووناک دەکاتەوە،
ناتوانێت تاریکییە بچوکەکەت ڕووناک بکاتەوە؟!!

***

(٥٣)

بە بەهێزی و پتەوییەوە بەرانبەر کەسەکان بمێنەرەوە،
دواتر بە هەموو لاوازییەکانتەوە بچۆرە بەردەم خودا.

***

(٥٤)

ئاسمان چەند دوورە، خوداش چەندێ نزیک!

***

(٥٥)

خودا بەخشینی شتێکی جوانت بۆ دوادەخات
هەتا بە جوانتر پێت ببەخشێت، گەشبین بە!

(٥٦)

وتم: ئازارم هەیە!
خودا فەرمووی: ﴿ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ ﴾ سوورەتی الزمر ٥٣
واتە: نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا

وتم: بێ کەسم!
خودا فەرمووی: ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾ سوورەتی ق ١٦
واتە: ئێمە لەوەوە نزیک ترین (بە زانیاریمان) لە شادەماری دڵی.

وتم: خودایە هیوایەکم پێ ببەخشە!
خودا فەرمووی: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾ سوورەتی الشرح ٥
واتە: بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت.

وتم: چۆن خەونەکانم بێتە دی؟
خودا فەرمووی: ﴿ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ ﴾ غافر ٦٠
واتە: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.

**جیهان پشتت تێدەکات، ئایەتێک دەبێتە پشتیوانت!**

(٥٧)

بەو کەسە بڵێن کە براکەی کۆچی کردووە و لە کفن پێچراوە

﴿ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴾ سورەتی التوبة ٤٠

واتە: خەم مەخۆ بێگومان خوا لە گەڵمانە !

بەو کەسە بڵێن کە زانیویەتی نەخۆشییەکی کوشندەی هەیە

﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴾ سورەتی الشعراء ٨٠

واتە: کاتێ نەخۆش بکەوم هەر ئەو شیفام دەدات.

بەو دایکە بڵێن کە شەوانە بێدارە،

نزا بۆ ڕۆڵەکانی دەکات بگەڕێنەوە بۆلای

﴿ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِيٓ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ ﴾

واتە: مەترسە و خەفەتیش مەخۆ، ئێمە دەیگێڕینەوە بۆلات...

بەوکەسە بڵێن لە غوربەتدایە و بیری ئازیزانی دەکات

﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾ ق ١٦

واتە: ئێمە لەوەوە نزیک ترین (بە زانیاریمان) لە شادەماری دڵی.

(٥٨)

قورئان بەبێ مەبەست باسی چیرۆکی پێغەمبەران ناکات.
کام ناڕەحەتییەی پێیدا تێدەپەڕین،
لە چیرۆکی پێغەمبەراندا سەختتر بوونی هەیە!

گەر لە چیرۆکی پێغەمبەران بڕوانیت
نەخۆشی، شاربەدەری، لەدەستدان
نەزۆکی، زیندان، ترس.... هەموو ئەمانە دەبینیت
دەبینیت خودا بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا
دەبینیت چۆن لەو حاڵەتانە ڕزگاریان بووە!

**قورئان پێت دەڵێت، بێ ئومێد مەبە.**

*ئەدهەم شەرقاوی*

***

(٥٩)

نازانیت چ ساتێک پێت دەوترێت

﴿ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ ﴾ سوورەتی طه ٣٦

واتە: بەڕاستی ئەوەی داوات کرد پێت درا.

لە نزا بێزار مەبە!

هەموو داواکانت بەرەو پەروەردگاری جیهانیان بەرزبکەوە.

***

(٦٠)

**تەنها لە یەک سوجدەدا سکاڵای خەمەکانت بکەی بۆ خودا، زۆر باشترە لەوەی چەندین ساڵ سکاڵای خەمەکانت لەلای مرۆڤەکان بکەیت.....**

***

(٦١)

خودا هەموو دەرگاکان بە ڕووتدا دادەخات
بۆ ئەوەی بە تەنها لە دەرگای ئەو بدەیت......



(٦٢)

تەواو دڵنیابە!
خودا واز لە کەسی خۆڕاگر ناهێنێت،
هەتا بە تەواوی پاداشتی نەداتەوە!
پاداشتێک کە چەند بەرانبەری خۆڕاگرییەکەیە
بۆ ئەوەی هەموو خەم و ئازارەکان لەبیربکات.



(٦٣)

گەر پێویستیت هەبوو، بەڵام توانات نەبوو،
ئەوا خودایەکت هەیە توانای هەیە و پێویستی نییە!
﴿ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴾ سوورەتی فاطر١٥
واتە: ئێوە هەژارو نەدارن و هەمیشە ئاتاجی خودان، هەر تەنها خودایە کە بێ نیازە و شایانی سوپاسە.

***

(٦٤)

هێندە متمانەی بە خودا هەبوو
لە ڕۆژێکدا کە ئاسمان ساماڵ بوو
دەچوو بۆ سەرکێڵگە وشکەکەی
بۆ ئەوەی داوا لە خودا بکات باران ببارێنێت
چەتر و پاڵتاوی لەگەڵ خۆی دەبرد
بۆ ئەوەی کە هاتەوە لە ڕێگادا باران تەڕی نەکات!

(٦٥)

نەکەی شەیتان قەناعەتت پێبکات
کە خودا تەنها تەوبەی ڕاستگۆکان وەردەگرێت و
تەنها دەرگا بۆ ئەوانە دەکاتەوە خاوەنی ئیمانێکی پتەون.

سوێند بە خودا
هەرگیز دەرگا بە ڕووتدا داناخات
گەرچی تاوانەکانت هێندە زۆربن بگاتە ئاسمان.
گەر تاوانت ئەنجامدا، لوتبەرزی نەتگرێت و تەوبە نەکەیت.

**چاکەت خۆشبوێت گەرچی ئەنجامت نەدا.**
**ڕقت لە خراپەبێت گەرچی ئەنجامیشت دا.**

مژدەت لێ بێت.....

***

(٦٦)

چەندێ پێداویستیت زۆر بوو
چەندێ هەژاربوویت
چەندێ دەرگاکان بە ڕووتدا داخران
تەنها داوا لە خودا بکە
تەنها چاوەڕێی بەخشینی خودابە
تەنها ئومێدت بە خودا بێت بۆ دڵخۆشبوونت
خودا پێی خۆشە تەنها داوا لەوبکەیت
لەوکەسە ڕازییە کە سەرەتا داوای لەوکردووە
گەر وات کرد
خودا هیوا و بەختەوەریت پێدەبەخشێت
هۆکارەکانی دڵخۆشیت بۆ ئاسان دەکات.

***

(٦٧)

ئەو دەمەی نوح دوعای کرد

فەرمووی: ﴿ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴾

بە خەیاڵیدا نەهاتبوو کە لەبەر خاتری ئەم،

خودا هەموو مرۆڤایەتی ژێرئاودەخات.

**متمانەت بە خودا هەبێت.**

***

(٦٨)

مەریەم وتی: ﴿ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴾

واتە: ئای خۆزگە پێش ئەم ڕووداوە بمردمایە،

و من شتێکی لەبیرچووەی باس نەکراو بوومایە.

مەریەم نەیدەزانی لە سکیدا پێغەمبەرێکی هەڵ گرتووە.

هەندێک ناڕەحەتی و تەنگەژە،

بەختەوەری و خۆشیەکی زۆریان لە خۆگرتووە

هەربۆیە بێئومێد مەبە گەر ناڕەحەتییەکانت درێژەیان کێشا....

(٦٩)

پەیامێک بۆ هەموو کەسێکی خەمبار
﴿لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌۚ﴾ سوورەتی البقرة٢٥٥
واتە: خودا نە وەنەوز دەیگرێت و نە خەو.

دڵت ئارام بێت
ئەندامەکانت هێمن بن،
دوودڵییەکەت بڕوات،
خاوەنی ئەم گەردوونە کارەکانت بەڕێوە دەبات،
فەرامۆشت ناکات،
لەبیرت ناکات،
هیچ شتێکی لێشارەوە نابێت...

***

(٧٠)

تاقی بکەرەوە ئەوکاتەی ئاواتێک دەخوازیت
بڵێیت " لاحول ولاقوة إلا بالله "
نیەتت وابێت ئەم ئاواتەت دێتە دی
زۆر دڵنیابە و متمانەت بە خودا هەبێت
کە خودا شەرمەزارت ناکات و ئاواتەکەت دێتە دی....

***

(٧١)

پەنجەیەکت بخە سەرگەردنت
هەست بە شادەماری دڵت دەکەیت
سەرسام دەبیت چەندێ لێتەوە نزیکە
پاشان لەم ئایەتە ڕابمێنە: ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾
واتە: ئێمە لەوەوە نزیک ترین (بە زانیاریمان) لە شادەماری دڵی.

***

(٧٢)

- دایەگیان خودا گوێبیستی نزاکانمانە؟
+ بەڵێ ڕۆڵەگیان.
- ئەی بۆچی ئەوەی لێم داوا کرد، پێی نەبەخشیم؟
+ چونکە دکتۆر ئەو دەرمانەمان دەداتێ پێویستمانە،
نەک ئەوەی حەزمان لێیەتی.

***

(٧٣)

**کێ کاتژمێر چواری بەیانی گرنگی بە ئازارەکانت دەدات؟**
**+ خودا..........**

***

(٧٤)

ئەوکاتەی خودا دووجار لەسەریەک دەفەرموێت:

﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾

واتە: بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت، بێگومان لە ڕاستیدا لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت.

**ئەوا بزانە، کارەکە تەنها پێویستی بە کەمێک خۆڕاگرییە و هیچی تر.**

***

(٧٥)

دەزانم لە درەنگانێکی شەودا بیر لە داهاتوت دەکەیتەوە،
ترست هەیە خۆشەویستانت توشی نارەحەتی دنیا ببن،
دەتەوێت شتێک بەدەست بهێنیت بۆ ئەوەی کەمێک لەم ترسەت برەوێتەوە، بەڵام ناتوانیت.
هەموو ئەوەی دەتەوێت ژیانێکی ئارام و هێمنە،
وادەزانیت بەدەستهێنانی ئەمەش زۆر ئاسانە،
بەڵام دواتر ڕووبەڕووی چەندین دۆخی ناخۆش دەبیتەوە!

ئارام بە، شتێک هەیە تا ئێستا ئەنجامت نەداوە.
زاتێک هەیە پشتی پێببەستیت!
ئەندازەی خەمەکەتی بەلاوە گرنگ نییە!
ئەندازەی کارە ئاڵۆز و چارەسەرنەکراوەکانتی بەلاوە گرنگ نییە!
هەموو شەوێک بانگت دەکات، بەندەکەم چیت پێویستە؟
بەندەکەم چ داوا دەکەی پێت ببەخشم؟
**تۆ خودات هەیە.........**

(٧٦)

خودایە، تەنها خۆت دەزانیت

ڕۆشتنی موسا چەندێ کاریگەری لە دڵی دایکیدا هەبوو!

بەڵام پێت فەرموو: ﴿وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِيٓ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ﴾

واتە: مەترسە و خەفەتیش مەخۆ بەڕاستی ئێمە دەیگێڕینەوە بۆلات.

تەنها خۆت دەزانیت ئازاری مەریەم چەندێ زۆربوو کە وتی:

﴿يَٰلَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا﴾ واتە: ئای خۆزگە پێش ئەم ڕووداوە بمردمایە!

لە ڕێی نێردراوەکەتەوە پێتان فەرموو:

﴿أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾

واتە: خەفەت مەخۆ و غەمبار مەبە، بێگومان پەروەردگارت لە خوارتەوە جۆگەیەک ئاوی بۆ فەراهەم هێناوی.

تەنها خۆت دەزانیت ئازاری یەعقوب چەندێ زۆربوو!

کە وتی: ﴿إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّي وَحُزْنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾

دواتر یوسفت بۆ گەڕاندەوە.

**خودایە شتێکی لەم شێوەش بۆ ئێمە..........**

(٧٧)

سڵاو بۆ ئەوانەی، کە خوێندیانەوە: ﴿يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾
واتە: ئەوە خودایە لە ژوور ئاسمانەوە کاروباری زەوی ڕێک دەخات و سەرپەرشتی دەکات.
**کارەکەیان بۆ خودا بەجێ هێشت.**

سڵاو بۆ ئەوانەی، کە خوێندیانەوە: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾
**دڵنیابوون خۆشی هەر دێت!**

سڵاو بۆ ئەوانەی کە خوێندیانەوە: ﴿فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾
واتە: چ گومانێکتان هەیە لە پەروەردگاری جیهانیان؟!
**وتیان چاکە و بەخشین خودایە!**

***

(٧٨)

﴿ يَٰمُوسَىٰٓ أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ ۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلْـَٔامِنِينَ ﴾ سوورەتی القصص٣١

واتە: ئەی مووسا وەرە پێش و مەترسە، بەڕاستی تۆ لەو کەسانەی بێ باک و بێ ترسن.

ئەوەی لە پاڵ خودابێت ئارامە!

هەرکەسێک خودا بیپارێزێت، پارێزراوە!

هەرکەسێک خودا پاراستی

چ ترسێک پێی دەگات......!

***

(٧٩)

**" کەسێک هەیە داوام لێبکات، پێی ببەخشم!"**

مەرج نییە تەنها لە نوێژدا داوا لەخودا بکەیت!

پارشێوان داوا لە خودا بکە، گەرچی لە جێگاشدابوویت.

***

(٨٠)

﴿ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾

**واتە: من باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خودا دەکەم.**

**یەعقوب کاتێک ئەمەی فەرموو**

**کوڕەکەی لەدەست دابوو، بینایی نەمابوو.**

**خودا کوڕەکەی و بیانیی بۆ گەڕاندەوە...**

**هەرکەسێک دەیەوێت سکاڵای خەمەکانی بکات،**

**با سکاڵاکانی بباتە لای خودا!**

***

(٨١)

﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾

واتە: من باسی خەفەت و پەژارەم هەر لای خودا دەکەم.

چەندێ هاوڕێت زۆربێت

چەندێ هاوڕێی نزیکت هەبێت،

ئارامی و دڵخۆشی و هێمنی،

ڕازی بوون و سەربەرزی و سەرکەوتن

بەدەست ناهێنیت، تەنها لە سکاڵابردنە لای خودا نەبێت........

هەندێ ئازار هەیە هیچ کەسێک لێی تێناگات،

ئەگەرچی باسی بکەیت و ڕوونی کەیتەوە

تەنها خودا لێت تێدەگات،

تەنها ئەو دەزانێت چیتە و چیت پێویستە.....

(٨٢)

﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ سوورەتی الصافات ٩٩

ئیبراهیم وتی: من دەڕۆم بۆ لای پەروەردگارم، دڵنیام ڕێنموونیم دەکات.

هەرکات دڵت تەنگ بوو، بڕۆ بۆلای خودا!
هەرکات دنیات لەبەر تەنگ بوو، بڕۆ بۆلای خودا!
هەرکات ئازاریان دای، بڕۆ بۆلای خودا!
هەرکات زۆر ناساغ بووی، بڕۆ بۆلای خودا!
هەرکات زۆر ناڕەحەت بووی، بڕۆ بۆلای خودا!

**بە دڵێکی پڕ متمانەوە بڕۆ بۆلای خودا،**
**دڵنیابە ڕێنمونیت دەکات.....**

لە هەموو شتێک بێ پێویستت دەکات
لەگەڵ خودا بە،
هەموو کارەکانی ئەم گەردوونە لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە!

(٨٤)

﴿إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾

ئەو نەفسەت زیندوو دەکاتەوە، کە لە ناو دونیادا ڕۆچووە!
ئەو ژیانە ئارامەت بۆ دەگێڕێتەوە، کە خەم و ئازار دایپۆشیووە!
ئەو ئازیزەت بۆ دەگەڕێنێتەوە، کە بێئومێدی لە گەڕانەوەی!

**تەنها سوجدە ببە و لێی نزیک بەرەوە.**
**شکاویت ڕابگەیەنە، سەرکەوتنت پێدەبەخشێت.**

***

(٨٥)

هەرکات دڵتەنگ بوویت
بیری خۆتی بخەرەوە
چۆن نوح ڕزگاری بوو لەوشەپۆلانەی وەک شاخ وابوون!
چۆن ئیبراهیم لە ئاگر پارێزرا!
چۆن یونس لە ناوسکی نەهەنگەکە ڕزگاری بوو!
چۆن ڕووبارەکە بۆ موسا دوولەت بوو!

**جوانترین شت لە فریاکەوتنی خودایی ئەوەیە**
**لە کاتێکدا دێت، کە بێئومێد بوویت لە هەموو هۆکارەکان!**
**لە کاتێکدا دێت، تەنها خودا لە دڵتدا ماوەتەوە!**

(٨٦)

ئەو دەمەی باوک و برا و کەسە نزیکەکانی یوسف
لە دەووری کۆبوونەوە، یوسف فەرمووی:
﴿أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾سوورەتی یوسف ١٠١
واتە: خودایە تۆ پشتیوان و یارمەتی دەری منی لە دنیا و لە ڕۆژی دوایی دا.

**سوێند بە خودا هیچ شتێک ناگاتە پشتیوانی خودا بۆ بەندەکەی.**

***

(٨٧)

نوێژ دەکەیت، هانا بۆ خودا دەبەیت و نزا دەکەیت، بەڵام خودا بە ئارامی و هێدی هێدی وەڵامت دەداتەوە، زۆر جار هەست دەکەیت فەرامۆش کراویت و بە تەنها ماویتەتەوە، خوداش لەگەڵت نییە، بەڵام پێویست بوو ماوەیەک لە ئازار و خەمدا بژیت، ئازارت چەشتووە و خوداش یەکسەر ڕزگاری نەکردوویت!؟.
لە داهاتودا ئەوە دەزانیت کە خودا هەموو ئەوانەی لەبەر تۆ بووە، بۆ ئەوەی بەدرێژای ژیانت بە خۆشی و شادی و ئارامی بژیت.

(٨٨)

﴿ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ﴾

واتە: بێزاربوون لە گیانی خۆشیان و زانیان هیچ پەناگەیەک نییە لە (سزای) خوا مەگەر پەنایی خۆی.

ڕۆژێک دێت هەست دەکەیت لەم جیهانەدا تەنیایت،

دەگریت و کەس گوێی لە گریانەکەت نییە!

ئازار دەچێژیت و کەس نییە دڵنەوایت بکات!

هەموو دەرگاکان بەڕووتدا دادەخرێن،

**بۆئەوەی بگەیت بەو دەرگایەی هەرگیز داناخرێت.......**

***

(٨٩)

کە دڵنیابوویت ﴿إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ﴾

واتە: بێگومان کاروبار هەمووی بەدەست خوایە.

کە دڵنیابوویت ﴿يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ﴾

واتە: ئەو خوایە لە ژوور ئاسمانەوە کاروباری زەوی ڕێک دەخات و سەرپەرشتی دەکات.

شوێنەواری ئەمە لە دڵتدا هەست پێدەکەیت!

هەست بە گۆڕانکاریی دەکەیت لە ژیانتدا!

نهێنی بەڕێوەبردنی خودا تووشی سەرسوڕمانت دەکات!

ڕووناکی باربوونی کارەکانت لەلایەن خوداوە بە تەواوی هەست پێدەکەیت!

***

(٩٠)

ئەوکاتەی لەگەڵ خودادا دەدوێیت، گەرچی فرمێسکی زۆریش بڕژێت یان وشەکان تێکەڵ بکەیت، بریندار نابیت و هەست بە شەرمەزاری ناکەیت، چونکە دەزانیت ملکەچ بوون و زەلیل بوون بەرانبەر خودا هێز و توانایە.

***

(٩١)

بەختەوەربوونت لە غەیری خودادا مەبینەوە،
لەبەرئەوەی کەسی نزیک دووردەکەوێتەوە،
خۆشەویستانت بێ وەفا دەبن، ئەوانەی لە ژیاندان دەمرن.
ماڵ و تەندرووستی و سامان نامێنێن......
**ئەوە تەنها پەروەردگاری جیهانیانە دەمێنێتەوە.**

***

(٩٢)

لێیان پرسی: بۆ هەمیشە ڕووت بە خەندەیە؟
وتی: شەرم دەکەم خەمباربم،
لە کاتێکدا هەموو کارەکانم بە دەستی خودایە.

***

(٩٣)

ئارام بە، خودا لەگەڵتە!
ئەو دڵەت کە بریندار کرا، خودا سارڕێژی دەکات!
ئەو شتانەی هەستیان بریندار کردی،
خودا خۆی بۆت چاک دەکاتەوە!
ئەو دەرگایەی داخراوە بە ڕووتدا، خودا بۆت دەکاتەوە!
**هەموو ئەمانە تەنها بۆ ئەوەیە کە ئارام بیت.**

***

(٩٤)

ئەو ئازارانەی کە هیچ کەسێ ئاوڕی بۆ نەدایەوە
لە ژێر چاودێری خودادایە!
متمانەت بە خودا هەبێت و بێئومێد مەبە!

***

(٩٥)

ئەو کاتەی خودا فەرمان دەکات
لە نێوان بەردێکی ڕەقدا گوڵێک بڕوێت
دەڕوێت.....!
کارەکانی تۆش بە هەمان شێوەن.

***

(٩٦)

هەتا خودا گوێبیستم بێت.......

ئاوات دەخوازم و، داوای لێدەکەم.

***

(٩٧)

﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ﴾ سوورەتی الشوری ١٩

واتە: خودا دڵسۆزە بۆ بەندەکانی.

بەسۆزیی هەموو کەسەکانی بەرانبەرت کۆبکەیتەوە،

لەسەرووی هەموویانەوە بەسۆزیی دایک و باوکیشت بێت،

هێشتا ناگاتە دڵۆپێک لە دەریای بەسۆزیی خودا.

(٩٨)

نەخۆش دەکەویت،
چونکە خودا دەیەوێت لێت خۆشبێت.

بەڵات تووش دەبێت،
چونکە خودا دەیەوێت میهرەبانیت بەسەردا بباریێنێت.

خەفەتت تووش دەبێت،
چونکە خودا دەیەوێت نرخی دڵخۆشی بزانیت.

**هەرگیز میهرەبانی خودات لێ نابڕێت.**

***

(٩٩)

**بێ ئومێد مەبە،**
**گەنجینەکەی خودا، لە پێداویستیەکانی تۆ زۆر گەورەترە.**

***

(١٠٠)

ئایا هەموو کارەکانت بەدەستی خودا نییە؟
دەی کەوایە، ئارام بە.

***

(١٠١)

کە خودا بەندەیەکی خۆی خۆشویست
بیری دەکات، وەک چۆن هاوڕێیەک بیری هاوڕێکەی دەکات.

(١٠٢)

- حاڵت چۆنە لەگەڵ خودادا؟
+ هەموو شەوێک دەخەوم و ئامادە نیم بۆ دیداری،
هەموو ڕۆژێک مۆڵەتم دەدات، بەڵکوو بگەڕێمەوە.....

***

(١٠٣)

ئەگەر کەشتیەکە کون نەکرایە، دەستیان بەسەردا دەگرت!
ئەگەر منداڵەکە نەکوژرایە، دەبووە خەفەت بۆ دایک و باوکی!
ئەگەر دیوارەکەیان چاک نەکردایە، مافی بێباوکەکان دەخورا!

**بزانە خێر و چاکە ئەوەیە کە خودا بۆمانی هەڵدەبژێرێت.**

(١٠٤)

﴿فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا﴾ سوەتی نوح ١٠
واتە: داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەن خودا لێخۆشبووە.

ئەوکاتەی دەڵێیت " أستغفرالله "
داوای دوو شتت لە خودا کردووە:
داپۆشینی تاوانەکەت و
لێخۆشبوونت لێی بەجۆرێک سزات نەدا لەسەری.

***

(١٠٥)

قورسترین جۆری دووری ئەوەیە
کە لە خودا دووربیت، لە کاتێکدا خودا دەفەرموێت:
﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴾

***

(١٠٦)

پیاو چاکێک فەرمووی:
ئەگەر خودا برایەکی پێبەخشیبوویت
هاوکاری دەکردیت لە کاری چاکەدا،
بزانە خودا دەیەوێت تووشی چاکە ببیت.

کە خودا هیدایەتی دایت نزا بکەیت
بزانە دەیەوێت پێت ببەخشێت.

کە وای لێکردیت کاری خەڵکی ڕاپەڕێنیت،
بزانە خودا جێت ناهێڵێت.

گەر سازانتی یادی بکەیتەوە
بزانە خۆشی دەوێیت.

**گەر خودا بەندەیەکی خۆی خۆشبوێت**
**بە توانای دەکات، سەری دەخات، وەڵامی دەداتەوە.**

* * *

(١٠٧)

بە دڵتەنگی و بێتاقەتیەوە باسی خەم و کێشەکانی بۆ دەکرد.
وتی: دەتوانیت ئەم وتانەی ئێستا لە سوجدەدا بۆ خودا باس بکەیت؟

دوای ماوەیەک هاتەوە و پێی گوت: ئیتر خەمەکانم بۆ کەس باس ناکەم، سوپاس بۆ خودا ئێستا زۆر باشتربووم.

**تۆش تاقی بکەرەوە.**

***

(١٠٨)

لە کاتی دوعاکردندا
خودا ڕەوانبێژی تۆی ناوێت، بەڵکوو دڵتی دەوێت.

(١٠٩)

**زۆر جار داوا لە خودا دەکەین، حاڵمان بگۆڕێت،**
**لێ نازانین خودا دەیەوێت بەهۆی ئەم حاڵەوە بمانگۆڕێت.**

(١١٠)

نووسیبووی: خودایە دڵەکان بگەیەنە بە ئاواتی خۆیان.
منیش بۆم نووسی:
ئەگەر خودا وەڵامی دوعاکەت بداتەوە، ئەوا هەمووومان تیادەچین، چونکە لەوەیە شتانێکمان پێ خۆشبێت، بەڵام بۆ ئێمە خراپ بێت.

جوانترە دوعاکەی پێغەمبەری خودا بکەین، کە پڕە لە تەسلیمبوون:
پەروەردگارا داوای هەموو چاکەیەکت لێدەکەم،
ئێستایی و داهاتووشی، ئەوەی من دەیزانم و ئەوەشی نایزانم.

(١١١)

گەر دەتزانی خەڵکی چەندە بەخێرایی لەدوای مردنت لەبیرت دەکەن، لە ژیانتدا تەنها هەوڵی ڕازی کردنی خودات دەدا.

(١١٢)

گەر دوعات کرد،
دوای ماوەیەکی زۆر وەڵامت نەدرایەوە،
پێداویستیەکانیشت زۆر زۆربوون.
داوا لە خودا بکە لێت خۆشبێت!
**گەر لێت خۆشبێت،**
**پێداویستیەکان بۆ جێبەجێ دەبێت بەبێ ئەوەی داوای لێبکەیت.**

"ابن القیم"

(١١٣)

گەرچـی بەردەوام بـووی لـە دوعـا کـردن، بەڵام ناڕەحەتیەکانـت هەر مابوون، بزانە خودا نایەوێت بە تەنها وەڵامـی دوعاکانت بداتەوە، بەڵکوو دەیەوێت شتانێکت پێببەخشێت کە داوات نەکردوون.

"ابن القیم"

***

(١١٤)

پەروەردگارا

نوێژێک ناکەم، شایەنی تۆ بێت.

بە ڕۆژوو نابـم، وەک بە ڕۆژووبوونی داوود.

کە نەخۆش دەکەوم، وەک ئەیوب خۆڕاگرنیم.

وەک یونسیش تەسبیحاتت ناکەم.

وەک یەحیاش دینەکەمم بە بەهێزی نەگرتووە.

وەک یوسفیش ناتوانم چاو و ئەندامەکانم ببپارێزم.

بەڵام خودایە وەک ئەمانە تـۆم خۆشـدەوێت.

(١١٥)

خودا لە دایکت میهرەبانترە بۆت!
ئەگەر لە دەرگای خودات دا،
لەبەر دەرگاکەیدا وەستایت،
پەنات تەنها بۆ ئەو برد،
ڕاستت کرد لەگەڵیدا،
دڵت پڕبوو لەو قەناعەتەی کە پێویستت بەوە.

خودایە تەنها تۆم هەیە!
تەنها پەنام بۆتۆ هێناوە!
ئەگەر قەناعەتت بەمە هەبوو،
سووربوی لەسەری و لەبەردەرگاکەیدا وەستایت،

سوێند بەخودا،
پێویستیەکەت چەندێ گەورە بێت، خودا بۆت جێبەجێ دەکات.

(١١٦)

هەندێ لە پێشینانان فەرموویانە:
گەر لە ڕۆژی دوایدا سەرپشکم بکەن،
کە خودا لێپێچینەوەم لەگەڵ بکات، یان دایکم!
دەڵێم خودایە تۆ لێپێچینەوەم لەگەڵ بکە،
چونکە لە دایکم میهرەبانتری بۆم.

***

(١١٧)

ئەوکاتەی لە هۆکاری ئازارەکانمان دەکۆڵینەوە، بۆمان دەردەکەوێت زۆربەی ناڕەحەتی و ئازارەکانمان بەبۆنەی مرۆڤەکانەوە بوون، جوانترین شتەکانیش لەگەڵ خودادا تووشمان بوون.
ئێمەش هەر بەردەوام خۆمان لە خەڵکی نزیک دەکەینەوە و لە خوداش دووردەکەوینەوە.

"ئەدهەم شەرقاوی"

(١١٨)

هەرکەسێک تەواوی ژیانی پەیوەست بکات بە تەنها یەک شتەوە، بە جۆرێک پشت بەو شتە ببەستێت، بە سەرچاوەی هێزوتوانا و خۆشی و ئەمنی خۆی بزانێت.

**ئەوا بێگومان خودا بە هەمان شت تاقیدەکاتەوە**

**هەتا بۆی بسلەمێنێت، ئەم شتە بەتاڵ و هیچە و دەڕوات**

**ئەوە تەنها خودایە، هەردەم دەمێنێتەوە!**

﴿وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴾

واتە: چووە ناو باخەکەیەوە لە کاتێکدا کە ستەمکار بوو لە خۆی، وتی باوەڕ ناکەم هەرگیز ئەم باخەم لەناو بچێت.

**ئەنجامەکەی :**

﴿وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴾

واتە: سامان و بەروبوومەکەی لەناوبرا (بە هەورە بروسکە سوتاو نەما) ئینجا کابراش لە داخا دەسەکانی دەپرواند و ئەم دی و دیوی پێ ئەکردن لەسەر ئەوماڵەی کە خەرجی کرد بوو تیایدا لە کاتێکدا (کەپری) باخەکەی هەموو کەوتوون بەسەر یەکدا و دەیووت کاشکای کەسم نەکردایە بە هاوەڵی پەروەردگارم.

(١١٩)

"بە گوێرەی خەونەکانت داوا لە خودا مەکە،
بەڵکوو بە گوێرەی ئەندازەی موڵکەکەی داوای لێ بکە!
خودا خاوەنی ئاسمان و زەمینە،
هیچ شتێک دەستەوسانی ناکات،
هەربۆیە داوای شت گەلێکی مەحاڵی لێبکە....

* * *

(١٢٠)

گەر پرسیاریان لێکردیت بۆ ئاوا غەمبار و بێ تاقەتیت؟
بەڕاستی وەڵامبدەرەوە، پێیان بڵێ:
أستغفرالله کەم دەکەم، و قورئانم پشت گوێ خستووە!

"عەلی تەنتاوی"

(١٢١)

هەندێ دەرگا بەڕووتدا نەکرایەوە،
چونکە هیی تۆ نەبوون.

هەندێ کەس جێیان هێشتیت،
چونکە پەڕەیەک بوون لە ژیانت نەک کتێبێک.

هەندێ ئاواتت نەهاتە دی،
چونکە کاتەکەی گونجاو نەبوو.

هەندێ هەلت لەدەستدا،
چونکە بۆ سەرکەوتن پێویستت بە ئەزموونی زیاترە.

**هەندێ ئازار درێژەیان کێشا،**
**چونکە دڵخۆشیەکەی دواتری زۆر زۆر زیاترە.**

(١٢٢)

مەریەم بە کۆمەڵێک ڕووداوی سەخت و ناخۆشدا تێپەڕی لەگەڵ ئەوەشدا پێی وترا، ﴿فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا﴾ واتە: بخۆ و بخۆرەوە، چاو و دڵڕۆشن بە!

ژیانی خۆت بە ئارامی بەڕێبکە،
گەرچی باردۆخیشت زۆر ناخۆشبوو،
بە زۆر بیرکردنەوە لێی خۆت لەناو مەبە.
**خودا بە جوانترین شێوە کارەکانت بەڕێوە دەبات.**

❋ ❋ ❋

(١٢٣)

﴿ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًاۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ سوورەتی ص ٤٤

واتە: بەڕاستی ئێمە ئەیوبمان بە خۆگر بینی چ بەندەیەکی چاک بوو بەڕاستی ئەو زۆر گوێڕایەڵ و ڕوو لەخوا بوو.

دوای چەندین ساڵ لە تاقیکردنەوە،
دوای تەمەنێک لە ناڕەحەتی،
لە نەخۆشی، لە لەدەستدان،
خودا بە ئارامگر ستایشی دەکات.
خوداش قەرەبووی بۆ کردەوە،
هەتا ڕازی کرد، زەنگینی کرد،
بێ پێویستی کرد لە هەموو کەسێک.

***

(١٢٤)

خودای گەورە دەفەرموێت:

**گەر بەندەکەم ویستی تاوانێک ئەنجام بدات، لەسەری مەنووسن هەتا ئەنجامی دەدات، ئەگەر ئەنجامی دا تەنها یەک تاوانی لەسەر بنووسن، گەر لەبەر منیش وازی لە تاوانەکە هێنا چاکەیەکی بۆ بنووسن، گەر ویستی کارێکی چاک بکات و ئەنجامی نەدەدا چاکەیەکی بۆ بنوسن، گەر ئەنجامی دا لە دە هێندەوە و بۆ٧٠٠ هێندە بۆی بنووسن....**

**لەبارەی میهرەبانی خوداوە بۆتان دەدوێم.**

***

(١٢٥)

بە دوعایەکی پێغەمبەر نوح، کە تەنها چوار وشە بوو، هەموو زەوی ژێرئاوکەوت﴿ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴾

واتە: بەڕاستی من شکستم خواردووە، دەی تۆ یارمەتیم بدە.

سولەیمانیش بە سێ وشە بووە خاوەنی هەموو زەوی.

﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا ﴾

**پێویست ناکات لە دوعاکانماندا زۆر بڵێین،**
**وشەکانی ڕێک بخەین و بیلاوێنینەوە،**
**بەڵکوو ئەوەی پێویستە تەنها ڕاستگۆی و دڵسۆزیتە،**
**خودا ڕەوانبێژی تۆی ناوێت،**
**خودا دڵتی دەوێت.**

***

**(١٢٦)**

**شتێکت بۆ باس دەکەم**
**کە دڵت ئارام بکاتەوە**
**خودا فەرموویەتی:**
﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ﴾
**واتە: هەردەمێ بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من ئەوا بێگومان من لێیانەوە نزیکم، گیرا دەکەم نزای نزاکاران هەرکاتێک هاوار و نزام لێبکەن.**

**دوعا کلیلە بۆ هەموو داخراوییەک.**
**قەدەر دەگۆڕێت.**
**دوعابکەو بێ ئومێد مەبە!**
**ئەوەی بۆتۆ بێت، هەردێت، گەرچی لاواز و بێتواناش بێت.**

***

(١٢٧)

باش بزانە گومانی باش بردن بە خودا
یەکێکە لە هۆکارەکانی وەرگرتنی دوعا
ئیتر بۆچی بێتاقەتیت و خەمباریت!
تۆ داوات لە خاوەنی ئاسمان و زەمین کردووە
ئەوەندە مەڵێ دوعام کرد، دوعام کرد،
لەوەیە کاتی وەڵامدانەوە زۆر نزیک بێت،
دڵخۆشیت نزیکتر بێت
ئەوەت بیر بێت
﴿ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرٌ ﴾ سوورەتی الحج ٦
واتە: بێگومان ئەو خودایە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

***

(١٢٨)

پەروەرێنە ئەو دڵنیایەی یەعقوبم پێ ببخەشە

﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾

واتە: بۆیە چارم دان بەخۆدا گرتنە بە جوانی، بەو ئومێدەی خوا هەموویانم بۆ بهێنێتەوە، بەڕاستی هەر ئەو زانای کار دروستە.

***

(١٢٩)

بەڕێوەبردنی کارەکانت لەلایەن خوداوە، لەوەی خۆت زۆر باشترە، ئەوەی حەزت پێیەتی لێت دەگرێتەوە وەک تاقیکردنەوەیەک، بۆ ئەوەی ببینێت چەندێ ئارامیت، ئارامگرییەکی جوانی نیشان بدە،

دەبینیت وردە وردە کارەکانت ئاسان دەبن.

هەموو ئەوانەی ڕوودەدەن بۆتۆ باشترن

جا بە بەخشین بێت یان لێگرتنەوە.

"ئیبنول جەوزی"

***

(١٣٠)

بیرت بێت

خودا ویستی لەهەرشتێک بوو، دەبێت.

گەرچی ئاوەز و لۆژیک و هەموو دانیشتوانی زەوی ڕوودانی ئەوشتە ڕەتبکەنەوە، کە خودا شتێکی ویست کەس ناتوانێت ببێتە ڕێگری.

﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ ﴾ واتە: خوا بەسەر کاری خۆیدا زاڵە.

***

(١٣١)

گەر زۆر زۆر حەزت دەکرد شتێک بەدەست بهێنیت

زۆر داوا لە خودا بکە و بڵێ :

**خودایە دەسەڵاتی خۆتم نیشان بدە لە ئاسانبوونی ئەم کارەدا.**

لە نێوان بانگ و قامەت،

لە نیوەی شەودا،

لە دوای نوێژەکان،

ئەم دوعایە بڵێرەوە.

پاشان ببینە خودا چۆن وەڵامت دەداتەوە.

متمانەم پێبکە خودا هەرگیز شەرمەزارت ناکات.

(١٣٢)

وامەزانە نەفست بەرەو لای کاری چاکەی بردووی،
بەڵکوو بزانە تۆ یەکێکیت لەو بەندانەی خودا خۆشی دەوێن
کەم تەرخەمی لەمەدا مەکە، لە بیرت بکات...

"ئیبنول قەییم"

***

(١٣٣)

لە یاسای مرۆڤەکاندا، ئەگەر متمانە شکا نایەتەوە.
لە یاسای خودادا
تۆبەکار لە تاوان وەک ئەوە وایە تاوانی ئەنجام نەدابێت.

***

(١٣٤)

هەرکەسێک دڵپاکی دەوێت،
ئەوا باخودا بەسەر هەواو ئارەزووەکانیدا سەربخات.
دڵێک وابەستە بێت بە ئارەزووەوە
بە ئەندازەی وابەستەبوونەکەی لە خودا بە دوورە.
بە یادی خودا و ملکەچ بوون دڵ ئاوەدان دەبێتەوە.
هەرکەسێک دڵی لەلای خودا بێت، ئارام دەگرێت
لەلای خەڵکیش بێت خەمبار و بێتاقەت دەبێت.

"ابن القیم"

***

(١٣٥)

دەتگەڕێنێتەوە بۆلای خۆی:

- به دڵتەنگبوونت لەدوای ئەنجامدانی تاوانێک.
- به ڕۆشتنی جەنازەیەک بەلاتدا.
- به بیستنی ئایەتێک کەوا هەست دەکەیت بۆتۆ دابەزیوە.
- بەهۆی نزای دایک و باوکتەوە.
- به نەخۆشییەک کە هەست بەلاوازی خۆت بکەیت.
- به خیانەت کردنی هاوڕێیەکت.
- بەڕۆشتنی هاوڕێیەکت.

**ئای چەندە بێ پێویستە لێت!**
**تۆش چەندە پێویستت پێیەتی!**

بەڵام هەردەتگەڕێنێتەوە بۆلای خۆی.....

***

(١٣٦)

تەنها خودا ئەو گڕکانە زۆرەی دڵت خامۆش دەکات.

تەنها خودا ئارامیت پێدەبەخشێت لە کاتە ناخۆشەکاندا.

تەنها خودا لە خۆت باشترە بۆت.

(١٣٧)

لە ژیانماندا هەندێ کەوتن، وانە و ئەزموونی نوێمان فێردەکەن.
هەندێ دڵخۆشبوون، هیوامان پێدەبەخشن.
نازانین قەدەر و داهاتوو چییان بۆ هەڵگرتوین،
لەسەرمان پێویستە گومانی باش بە خودای خۆمان بەرین.

❋ ❋ ❋

(١٣٨)

ئەو تاریکاییەی ئێستا تێیدایت، وادەزانیت کۆتایی دنیایە بۆت.
هێندەی ئەو تاریکاییە نابێت کە یونسی تێدابوو
لەناو سکی نەهەنگەکەدا
بە وتنی: لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ
لە هەموو ئەو تاریکیانە ڕزگاری بوو
ئایا خودا لەم تاریکاییە تۆ ڕزگار ناکات!!

❋ ❋ ❋

(١٣٩)

لە ڕێگای چوونت بەرەو خودا
لە ڕێگای تێکۆشانت بەرەو ڕازی بوونی
ڕێگاکەتت خۆشبوێت، چەندێ قورسیش بوو
ئارام بگرە لەسەر ناڕەحەتییەکانی
**تاڵی و شیرینی ئەم ڕێگایەت خۆشبووێت**
**ڕۆژێک دەتگەیەنێت بە بەهەشت.**

***

(١٤٠)

خودا هەر شتێک لە دڵتدا بمرێنێت،
لە دوای ئەو هەستێکی جوانتر و باشتر دەهێنێتە جێی.
متمانەت پێی هەبێت و پشتی پێ ببەستە!

***

(١٤١)

خودا ناتکاتە دۆخێکەوە کە لەتواناتدا نەبێت
دەزانێت دەتوانیت تێی پەڕێنیت .
ئارام بە، ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَاۚ﴾ سوورەتی البقرة ٢٨٦
واتە: خوا داوا لە هیچ کەسێک ناکات، مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی.

***

(١٤٢)

دایکم فێری کردم هەمیشە دوعا بکەم،
زۆر زۆر داوا لە خودا بکەم.
فێری کردم لەوەیە ئیمڕۆ زۆر سەخت و ناخۆش بێت،
بەڵام سبەینێ هێندەی پانتای گەردوون فراوان دەبێت.

***

(١٤٣)

بانگەوازێک کە دڵ زۆر ئارام دەکاتەوە:

" ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر تاوانەکانت بگاتە نزیکی ئاسمان،
پاشان داوای لێخۆشبوونم لێبکەیت، لێت خۆشدەبم "

***

(١٤٤)

ئەو ساتە دێت کە خودا
برینەکانت سارێژ دەکات،
دڵت ئارام دەکاتەوە،
هەموو شکاویەکانی چاک دەکاتەوە،
**کە خودا قەرەبووی بۆ کردیتەوە**
**لەبیرت دەچێت چیت لەدەستداوە.**

***

(١٤٥)

نازانیت چۆن پەیام و میهرەبانی خودات پێدەگات.
نازانیت چۆن دەرگات بەڕوودا دەکاتەوە.
کاتێک خودا ویستی شتێک ببێت کەس ناتوانێ ببێتە ڕێگری.
هیچ کەسێک لەخودا گەورەتر نییە....
الله أکبر

***

(١٤٦)

زۆر نزا دەکەیت،
زۆر داوای لێدەکەیت،
چونکە لەمەدا ئارامیی دڵت دەدۆزیتەوە،
دەزانیت ئەو زاتێکە چاودێریت دەکات، بیسەرە و وەڵامت دەداتەوە.

***

(١٤٧)

خەمبار مەبە!

ئەگەر ئەو دەرگایەی دەتویست بەڕووتدا بکرێتەوە، داخرا!

ڕۆژەکان تێدەپەڕن و بۆت دەردەکەوێت، خودا لە شتانێک ڕزگاری کردووی کە لە تواناتدا نەبوو بەرگەی بگریت.......

ئارام بە، بە بڕیار و دانایی خودا!

بزانە خێر و چاکە لە بژاردەکانی ئەودایە!

***

(١٤٨)

داوا لە خودا بکە،

ئەو باوەڕەی هەتە لەدەستی نەدەیت.

گومان دڵت داگیرنەکات،

هەر بەوەفابیت هەرچیەک ڕوویدا،

داوای لێبکە دڵ و ژیانت پڕ بکات لە بەختەوەری،

ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

﴿وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ سوورەتی الحج ٦

(١٤٩)

خودا ئەوساتانە لەبیرناکات کە تۆ هەوڵی دڵخۆش کردنی خەڵکیت دەدا، بەڵام خۆت زۆر خەمباربوویت.

لە بیری ناکات زۆربەخشندە بووی لەوشتانەی کە خۆشتدەویستن گەرچی هیچ کەسیش وەها نەبوو بۆتۆ.

ئەو هەنگاوانەت لەبیر ناکات کە دەتنا بۆ سارێژکردنی برینەکان، خۆشت لەناو بریندا نوقم بووبوویت

**دەبینیت خودا چۆن قەرەبووی هەموو ئەمانەت بۆ دەکاتەوە.**

❊❊❊

(١٥٠)

ئارامگرتن نهێنیەکە تەنها ئەوانە دەیزانن

باوەڕیان وایە، خودا هیچ لەبیرناکات.

لە کۆتاییدا بە باوەڕێکی پتەوەوە وەستاون

چاوەڕێن خودا بە کارەکەیان بفەرموێت ببە، ببێت!

پاشان دەگریەن بەهۆی هاتنە دی ئەو خەونەی چاوەڕوانی بوون.

(١٥١)

وەڵامت دەداتەوە، وەڵامت دەداتەوە،
ئەو خودایەی چەندین ساڵە نارەحەتیەکانت لەسەر لادەبات
ئەو خودایەی فێری کردیت چۆن دڵت ئارام بێت
چۆن بەختەوەر بیت، چۆن خۆشتبوویت.

ئەو خودایەی ئەوشتانەت پێدەبەخشێت کە بۆتۆ گونجاوە
رازیت دەکات.
﴿قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ﴾
بڵێ: هەر خوا ئێوە ڕزگار دەکات لەو مەترسییە و لە هەموو نارەحەتی و غەم و پەژارەیەک.

***

(١٥٢)

بە جۆرێک داوا لەخودا بکە،
وەک ئەوەی ڕووناکی وەڵامدانەوە دەبینیت.
خاترجەم بە ئەو دەنگە هێمنەت دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کراوەتەوە.
﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾
واتە: ئێمەش نزاو هاواری ئەومان گیراکرد، لەو غەم و خەفەتە ڕزگارمان کرد، هەرواش ئیمانداران ڕزگار دەکەین.

***

(١٥٣)

پاشان خودا ئارامی دادەبەزێنێتە سەر دڵت،
وات لێدەکات لە کونێکی ڕووناکیەوە دەربچیت،
کە هێندەی نوکە دەرزیەک دەبێت.
لە کۆتا ساتەکاندا خودی خۆت بەدەستدەهێنیتەوە،
هەموو خەم و ئازارەکانی دڵیشت لە دوای خۆت جێدێڵیت.

***

(١٥٤)

**هەتا بێزار نەبیت لە داوا کردن، خودا هەر پێت دەبەخشێت.**
**بەخششی خودا،**
**زۆر لە خەیاڵەکانت فراوانترە!**
**لە پێداویستیەکان گەورەترە!**
**لە ئاواتەکانت مەزنترە!**

❊❊❊

(١٥٥)

بیرت بێت خودا لە ئێمەوە نزیکە!
لە خودی خۆمان میهرەبانترە بۆمان!
بە توانایە بەسەر هەموو شتێکدا!
شتانێک دەزانێت لەبارەمانەوە کە خۆمان نایزانین!
پێمان دەبەخشێت بەبێ ئازاردان!
لێی وەردەگرین بەبێ پەشیمانی!

❊❊❊

(١٥٦)

ڕۆحی مرۆڤەکان وەک گوڵ وایە،
هەتا یادی خوا بکات گەشە دەکات و دەدرەوشێتەوە
هەرکاتیش لە یادی خودا بێ ئاگا بوو،
لە گەشە دەکەوێت و هەڵدەپورکێت.

***

(١٥٧)

ئەگەر خودا لە یەکەم تاقیکردنەوەدا یوسفی ڕزگاربکردایە
نەدەبووە عەزیزی میسر.
تاقیکردنەوە و ناڕەحەتیەکان درێژە دەکێشن
بۆ ئەوەی بەخششەکانیش زۆرتربن.

***

(١٥٨)

﴿وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ﴾

واتە: هیچ شتێک نییە ئیللا خەزێنەکانی لای ئێمەیە.

هەموو شتەکانت:

بەختەوەریت،

ئاواتەکانت،

سەلامەتیت،

هاوسەرگیری کردنت،

کارەکەت،

ڕۆزییەکەت،

هەمووی لەلای خودایە

داوای لێبکە با وەک باران بڕژێن بەسەرتدا.

***

(١٥٩)

هەموو ئەو دوعایانەی کردوتە، خودا بۆت دەهێنێتە دی.

لەوەیە درێژە بکێشێت،

لەوەیە شێوازەکەی بگۆڕێت،

لەوەیە لەو باشترت بداتێ،

بەڵام لە کۆتاییدا هەر بۆت دەهێنێتە دی.........

***

(١٦٠)

قەدەرمان دەگۆڕێت؟

ئەی ڕۆڵەگیان نەتزانیـووە دوعـا لەگەڵ قەدەردا ململانـێ دەکات، بەهـۆی بەهێـزی دوعـا و زۆر داواکردنـی کەسـەکە بەسـەر قەدەردا زاڵ دەبێـت، متمـانەت بێـت دوعـا دیمەنە شـێواوەکە ڕێکدەخاتەوە، تەنهـا دوعـا قەدەر دەگۆڕێت.

***

(١٦١)

دەرگا لێکردنەوەت زۆر لەوەنزیکترە کە گومان دەبەیت

ئەمڕۆ لە دوێنێ لێی نزیکتریت

مژدەکان لە ڕێگادان بەرەو تۆ:

چاکبوونەوەت،

ڕزگاربوونت لە ناخۆشییەک،

هەواڵێکی خۆش، دیداری ئازیزێک،

هەموویان لە ڕێگادان بەرەو تۆ

مادەم لە دوعا بێزارنەبوویت و بێئومێدیش نەبوویت لە ئارامی.

***

(١٦٢)

زۆر زۆر داوا لە خودا بکەن

هەتا خودا بفەرموێت:

**" ئەی فریشتەکان،**

**پێداویستی بەندەکەم جێبەجێ بکەن**

**یەقینەکەی زاڵ بوو بەسەر قەدەرەکەمدا "**

**لەبارەی بەخششی خوداوە بۆتان دەدوێم.**

(١٦٣)

﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِيٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْۚ﴾ سوورەتی غافر ٦٠

واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە

جۆری دوعاکەی دیاری نەکردووە،

ئەندازەی داواکەشی سنوردار نەکردووە،

تەنها داوای لێبکە و متمانەت هەبێت کە پێت دەبەخشێت.

ئەگەر نازانیت بە جوانی دوعا بکەیت و وشەکان ڕێک بخەیت،

**سەرت بەرزبکەرەوە بەرەو ئاسمان**

**بێرە گوێ بەو ورپینانەی لە ناختدایە**

**خودا دەزانێت چی لە دڵتدایە، ئەوەشی ناتوانیت بیدرکێنیت....**

❊❊❊

(١٦٤)

هەندێ کەس وادەزانن دوعا چەکی بێدەسەڵاتەکانە

خۆزگە بیانزانیایە، بێدەسەڵات ئەوکەسەیە لە دوعا بێ بەشە.

❊❊❊

(١٦٥)

لەو کاتانەی وادەزانیت دونیا دەتڕوخێنێت،
موناجات کردن لەگەڵ خودا بەهێزت دەکات.
دوعاکردن دەبێتە فریادڕەست لە دوای فەزڵی خوداوە.

***

(١٦٦)

لەگەڵ ئەوەی لە دۆڵێکی بێبەروبوومدا بوو،
بەڵام نزای بۆ کردن
﴿ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴾ سورەتی ابراهیم ٣٧
لە هەموو بەر و میوەیەکیش ڕۆزییان بدە، بەڵکوو شوکرانە بژێربن!

**هەرچەندە دۆخەکەت وشک بێت،**
**خودا دڵخۆشی و بەختەوەری تێدا دەڕوێنێت.**

***

(١٦٧)

دوعا دەکەیت، زۆرملکەچ دەبیت، بێئومێد دەبیت
بەڵام هیچ ئاماژەیەک نییە بۆ وەڵامدانەوەی دوعاکانت...
سەرکۆنەی خۆت دەکەیت، تۆ شایەنی ئەوەنیت وەڵامت بدرێتەوە.....
ئەم سەرکۆنە کردنە، ئەم دانپێدانانە،
وەڵامدانەوەی دوعاکانت خێراتر دەکات.
**خودا لەگەڵ دڵشکاوەکاندایە**

**بە ئەندازەی شکاویت، سارێژ دەکرێیت.**

***

(١٦٨)

یەکەمین چەکی لەناوبەر، لەسەر زەویدا بەکار هێنرا دوعابوو
بە دیاریکراوی لەوڕۆژەی، نوح دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و
فەرمووی: ﴿ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴾
واتە: پەروەردگارا مەهێڵە لەسەر زەوی هیچ کەسێک لە بێ بڕوایان.

**لەوانە بترسن کە دوعا تاکە پەناگەیانە،**
**دوعا تاکە چەکی دەستیانە!**

(١٦٩)

کێ مەنشاوی فێرکرد؟
کێ مامۆستای حوسەرییە؟
ئەی کێ قورئانی بە عەبدوولباست لەبەرکرد؟
کەس نایانناسێت!
لەگەڵ ئەوەشدا چی خێری ئەو قورئان خوێنە بەناوبانگانە هەیە، دەچێتە تەرازووی چاکەی ئەوانیشەوە.

چاکە بکە
خودا چاکەی چاکەکاران ون ناکات......
﴿ وَلَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ سوورەتی یوسف ٥٦

***

(١٧٠)

بەدبەختی و بێهیوایی لەگەڵ سێ شتدا کۆنابێتەوە

لەگەڵ چاکبوون بۆ دایک و باوک:

﴿وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارٗا شَقِيّٗا﴾

واتە: کردوومی بە ڕۆڵەیەکی چاکەکارو گوێڕایەڵ بۆ دایکم، نەشی کردووم بە مل هوڕێکی بەد ڕەفتار.

لەگەڵ دوعادا: ﴿وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا﴾

واتە: پەروەردگارم هەرگیز لە پاڕانەوەم لێت بێ هیوا نەبووم.

لەگەڵ زۆر قورئان خوێندندا: ﴿مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ﴾

قورئانمان نەناردۆتە خوارەوە بۆ سەر تۆ بۆ ئەوەی دووچاری ناڕەحەتی و غەم و پەژارە ببیت.

***

(١٧١)

بڕوانە پێغەمبەران چۆن لەبارەی خوداوە دەدوێن:

پێغەمبەر سالّح دەیفەرموو: (إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴾
واتە: بەڕاستی پەروەردگارم زۆر نزیکی دوعا وەرگرە.

پێغەمبەر شوعەیب دەیفەرموو: ﴿ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴾
واتە: بەڕاستی پەروەردگارم میهرەبانی دڵسۆزە.

پێغەمبەر نوح دەیفەرموو: ﴿ إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾
واتە: بەڕاستی پەروەردگارم زۆر لێبوردەی میهرەبانە.

یوسف دەیفەرموو: ﴿ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾
واتە: بەڕاستی پەروەردگارم بە سۆزە بەرامبەر ئەوەی بیەوێ بەڕاستی هەر ئەو زانای کاردروستە.

پێغەمبەر ئیبراهیم دەیفەرموو: ﴿ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴾
واتە: بەڕاستی پەروەردگارم بیسەری دوعا و پاڕانەوەیە.

پێغەمبەر سولەیمان دەیفەرموو: ﴿ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴾
واتە: بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەندو بێ نیازە.

(١٧٢)

زانایانی ئەم هەسارەیە ساویلکەن
وادەزانن ڕووناکی خێراترین شتی ئەم گەردوونەیە
نازانن دوعا مەودای نێوان ئاسمانەکان و زەمین
لە کەمتر لە چرکەیەکدا دەبڕێت!

***

(١٧٣)

دڵت ڕێکبخە،
لە دەرگای ئومێددا بوەستە،
بدە لە دەرگا لێت دەکرێتەوە.
دوعا بەخشینە.......!

***

(١٧٤)

مەولانا فەرمووی:

"دەستەوسان بوون ئاماژەیەکی خودایيە بۆ مرۆڤ
کە کاتی دوعا کردن هاتووە."

***

(١٧٥)

پەروەردگارا ئەگەر دوعاکانم جوان نەبوون،
خۆت پێداویستيەکانم دەزانيت. گەرچی کەميش بن
ئامانجەکانم دەزانيت و هيچ شتێکم لەلای تۆ شارەوە نييە.
سارێژی ڕازەکانم بکە بە نيعمەت و بەخششەکانت.

***

(١٧٦)

بەندەکان بە دابڕان تاقی دەکرێنەوە
بۆ ئەوەی تەنها لەگەڵ خودادا ئارام بن.

***

(١٧٧)

یەکێک لە پیاوچاکان باسی ئەو نیعمەتانەی دەکرد کە خودای پێی بەخشیووە، دەیفەرموو: لە نوێژی چێشتەنگاودا داوای هەرشتێکم لە خودا کردبێت، ئیللا پێی بەخشیووم.

***

(١٧٨)

خودا دەزانێت بارت گرانبووە و زۆر ئارام بووی.
دەزانێت دوعادەکەیت، ئاوات دەخوازیت،
هەربۆیە چاوەڕوانی چاکەبە لەلایەن خوداوە،
قەرەبووی ئارامگرییەکەت دەکاتەوە،
ڕازەکانت سارێژدەکات.
متمانەت پێی هەبێت و گومانی باشی پێ بەرە.

***

(١٧٩)

دەبینێت ئەو شتەی خۆشتدەوێت ئازارت دەدات، لێتدەگرێتەوە.
گومانی خراپی پێدەبەیت، پاشان حیکمەتەکەیت نیشان دەدات.
پاشان ئازاری دڵت دەگۆڕێت بۆ ڕازیبوون بە بڕیارەکانی
ئاوەز و دڵت ئارام دەبێت، چونکە ئەو خودایە.

***

(١٨٠)

بەم نزیکانە ڕازەکانت سارێژ دەکات،
چونکە خودا دەزانێت زۆر پێویستت بەدڵخۆشییە!

***

(١٨١)

ئەنەس فەرمووی خۆشەویست فەرموویەتی: خودا لەوبەندەیەی ڕازییە کە خواردنێک دەخوات سوپاسی خودای لەسەردەکات،
یان خواردنەوەیەکت دەخوات سوپاسی خودای لەسەردەکات.

***

(١٨٢)

خودا واز لە دڵێک ناهێنێت کە سەرپێچی دەکات.
ئەی چ دەبێت کە تۆ ملکەچی بیت و لێی ڕازی بیت؟!

***

(١٨٣)

ڕستەی " إنالله وإناإليه راجعون"
تەنها تایبەت نیە بە مردنەوە، بەڵکوو واتە:
خۆمان و ئەوشتانەی هەمانە و ئەوشتانەی خۆشمان دەوێن
هەموویان موڵکی خودان.

ویستی لە چیە بابیکات،
چیمان لێدەسێنێتەوە بالێمان بسەنێتەوە،
لەلای خودا ئەندازەی گەردیلەیەک بەهەدەر ناچێت.
با نەفسمان ڕازیبێت و ڕۆحمان ئارام بێت،
ئێمە موڵکی خوداین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە .

***

(١٨٤)

لە خۆشەویستترین وتەکان لەلای خودا
ئەوەیە کە بەندەکەی لە سوجدەدا بڵێیت:
پەروەردگارا، ستەمم لە خۆم کردووە، لێم خۆشبە!

***

(١٨٥)

بڕوام وایە هەرچی خراپەیەک هاتۆتە ڕێم،
بۆ ئەوەبووە لە خراپتر بمپارێزێت.

متمانەم بە خودا هەیە هەرچی لێسەندوومەتەوە،
بۆ ئەوەبووە باشترم پێببەخشێت.

متمانەم بە خودا هەیە ئاواتەخوازی هەرشتێکیش بووبم،
بەڵام هێشتا پێینەبەخشیوم، لە کاتی گونجاودا پێمدەبەخشێت.

ئەوەی منی لەم ژیانەدا هێشتووەتەوە
بڕوابوونمە کە خودا ئاگای لێمە!
چاودێریم دەکات، کارێکم بۆ دەکات، فریام دەکەوێت،
نازانم چۆن، بەڵام دڵنیام گرنگی دەدات بە کارەکانم.
ئەم بیرۆکەیە هەمیشە ڕزگارم دەکات.

***

(١٨٦)

ئەگەر خاوەنی ئەم گەردوونە بەشتێک بڵێ، ببە،
مەحاڵ دەڵێت بەڵێ!

***

(١٨٧)

چەند میهرەبانە...
کە دەتبینێت دڵت تەنگە، دڵخۆشت دەکات.
دڵنیایی و ئارامی دادەبەزێنێتە سەردڵت بەبێ ئەوەی هەست بکەیت
پاک و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە گرنگی بە ترپەترپەی دڵت دەدات.

***

(١٨٨)

بابەتەکە پەیوەندی بە بەختەوە نییە،
تاوانی زۆر ژیانت دەشێوێنێت،
داوای لێخۆشبوونی لێبکە!

(١٨٩)

گەرچی تاوانەکانت زۆربوون،
دوو دڵ مەبە لە گەڕانەوە بۆلای خودا.
**ئەو زاتەی ئابڕوی نەبردیت لە ژێر سەقفی تاواندا،**
**کە لەژێر باڵی تەوبەدا بیت، ئاشکرات ناکات.**

***

(١٩٠)

- لەبارەی خوداوە بۆم بدوێ؟
+ ئەگەر خـودا خۆشـی ویسـتیت، ئاسـمان و زەوی بە دانیشـتوانیانەوە خۆشیان دەوێت، دڵت لە بەهەشتدا نیشتەجێ دەبێت پێش ئەوەی بچیتە نـاوی، هیـدایەت دراوی، پـارێزراوی، بـێ پێویسـتی لە هەمـوو کەس، لە بەدبەختی دووردەبیت خەفەتیش لێت ڕادەکات.

***

(١٩١)

ئەوکاتەی قورئان دەخوێنیتەوە،
لە پەنای خۆتدا کاغەز و پێنووسێک دابنێ،
کە گەشتی بە هەر ئایەتێک کە خۆشت دەویست،
لە کاغەزێکی بچووکدا بینوسە!

دواتر ئەم کاغەزانە بکە سندوقێکەوە،
لەسەری بنووسە پەیامەکانی خودا بۆ من.

هەرکات زانیت پێویستت بە پەیامێکە،
بچۆ سندووقەکە بکەرەوە،
یەکێک لە کاغەزەکان هەڵ بگرە، و
پەیامی خودا بۆ خۆت بخوێنەرەوە..........

***

(١٩٢)

"چاوەڕوانیکردنی دەروو لێکردنەوە، پەرستشە."

ئیبنو ڕەجەب

***

(١٩٣)

خودا شەرمەزارت ناکات،
بەڵکوو ڕەحمەت و چارەکانی دوادەخات بۆ کاتێک کە خۆی دەیزانێت و تۆ نایزانیت.

***

(١٩٤)

لەوەیە ڕۆزییە دواکەوتووەکەی تۆ،
زۆر باشتربێت لە ڕۆزییە پێشکەوتووەکەی ئەوان.
ئارامبگرە و گومانی باشت بە خودا هەبێت.

***

(١٩٥)

" خودای گەورە بە بەڵایەک تاقیتدەکاتەوە،
بۆ ئەوەی شتێکت تێدا چاک بکات
ئەو شتە تەنها بەو بەڵایە چاک دەبێت...."

***

(١٩٦)

" حیکمەتی خودا نازانیت لە گرتنەوەی ئەو شتەی خۆشتدەویست، هەتا ئەو دەمەی قەرەبووکردنەوەکەی دەڕژێت بەسەرتدا"

***

(١٩٧)

پەروەردگارا ئەمە بکە بە نسیبمان:
" لە دونیا تۆم پۆشی،
ئەوا ئیمرۆ لێت خۆشدەبم!"

***

(١٩٨)

" لەوەیە بە خەیاڵتدا نەیەت،
دوعا چەندێ کاریگەری دەکاتە سەر ژیانت،
بەڵام ڕۆژێک دێت دوعاکانت هەموو خەم و ئازارەکانت لە یەک ساتدا دەگۆڕێت بۆ بەهارێک کە هەرگیز لە پێشتردا نەتدیووە"

***

(١٩٩)

گەورەترین ڕۆزی؛ ئەو دوعایەیە لە پەنهانیدا بە ناوی تۆوە بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان.
نە تۆ داوات لێی کردووە، نە دەیزانیت....

***

(٢٠٠)

ئەگەر کەسێکی بەناوبانگ پێت بڵێت تۆی خۆشدەوێیت،
لە خۆشیدا دەفڕیت
بیربکەرەوە،
گەر خودا بەو هەموو گەورەییەیەوە خۆشی بوێیت......!

(٢٠١)

"گەر منت خۆشدەوێت،
با منیش لەتەک ئەو پەیامانەدا بم کە دەینرێت بۆ ئاسمان،
**خۆشەویستی واتە دوعاکردن"**

***

(٢٠٢)

" نزاکردن بۆ ئەو کەسانەی خۆشتدەوێن،
جوانترین وێنەی خۆشەویستییە. "

***

(٢٠٣)

کە دڵخۆش دەبوو ڕووی دەگەشایەوە،
وەک ئەوەی پارچەیەک بێت لە مانگ.
"کەعبی کوڕی مالیک باسی پێغەمبەری خودا ﷺ دەکات"

(٢٠٤)

متمانەی تەواوت هەبێت
ئەو دەستەی بۆلای خودا بەرزدەکرێتەوە
بە خاڵییەتی ناگەڕێتەوە!

●●●

(٢٠٥)

ئای ئەم دەستەواژەیە چەندێ مەزنە
" نزام بۆ کردیت"
چ هەستێکت پێشکەش ئەو کەسە کردووە،
هەتا لە کاتی خەڵوەتی لەگەڵ خودادا بەشدارییت پێ بکات.

●●●

(٢٠٦)

گەر خودا ئەوەی لێت بینی کە خۆشی دەوێت.
ئەوەت بۆ بەردەوام دەکات کە خۆشت دەوێت.

***

(٢٠٧)

بەدەنگێکی هیوابڕاو و شکاوییەوە داوا لەخودا مەکە،
بەڵکوو داوای لێبکە و متمانەت بە تواناکەی هەبێت.
بە جۆرێک ڕووخۆشبە بۆ میهرەبانییەکەی
وەک ئەوەی داواکارییەکەت پێبەخشراوە.

پاشان مژدەت لێبێت بەوەڵامدانەوە

***

(٢٠٨)

" دڵنیابە، میهرەبانی خودا
زۆر فراوانترە لە ناڕەحتیەکانی ژیان!"

***

(٢٠٩)

" پەروەردگارا خۆڕاگرم وەک فەرمانت پێکردووم
مژدەم بدەرێ وەک پەیمانت پێداوم"

(٢١٠)

"پێی وتم: خودا دەرووت لێدەکاتەوە.
دایکم ئافرەتێکە درۆ ناکات"

***

(٢١١)

پاشان خودا ڕازیت دەکات،
وەک ئەوەی ڕۆژێک خەمبار نەبوو بیت

***

(٢١٢)

چەندێ تاوانت ئەنجامدا
بگەڕێوە!
خودا تەوبەکارانی خۆشدەوێت!

***

(٢١٣)

" پەروەردگارا گومانی باشم پێ بردوویت،
سارێژی برینەکانم بکە!"

***

(٢١٤)

خۆراگر بە لە کاتی لەدەستدانی ئەوشتانەی خۆشتدەوێن،
چونکە تۆ نازانێت بۆ لەدەستتداوە،
بەڵام خودا دەیزانێت!

***

(٢١٥)

" هەتا زیاتر خودا لە دڵتدا گەورەبێت،
شتەکان لە چاوتدا بچووک دەبنەوە"

***

(٢١٦)

**" خودا لە تەنهایەکانتدا دەتبینێت،**
**بە ئەدەب بـە!"**

***

(٢١٧)

ئیبنو جەوزی دەفەرموێت: پیرەمێردێکم بینی چەند خولەکێک پێش نوێژی نیوەڕۆ دەستنوێژی دەشۆرد.
لێم پرسی: ئەری بانگی داوە؟!
وتی: دەچم بۆلای خودا پێش ئەوەی بانگم بکات.

***

(٢١٨)

" پەروەردگارا پەنات پێدەگرین لەوەی چاوەڕوانی شتانێک بکەین،
کە بۆ ئێمە نەنووسراوە"

***

(٢١٩)

" دەستی ڕاستت بخە سەر دڵت و پێی بڵێ:
ئارام بە ئەی دڵ،
ئەوەی خودا ویستی لێبێت دەبێت و
ئەوەی ویستی لێنەبێت نابێت!"

***

(٢٢٠)

" دەستبگرە بە دوعاوە
وەک ئەوەی هیچ چارەسەرێک شک نابەیت تەنها ئەو نەبێت!"

***

(٢٢١)

" سڵاو لەوانەی باوەڕیان بە بەش و دادپەروەری خودا هەیە.
باوەڕیان وایە ئەوەی لەدەستیان چوو لەئەسڵدا بۆ ئەوان نەبووە.
باوەڕیان وایە بەخششی خودا ڕەحمەتە، گرتنەوەی حیکمەتە.
باوەڕیان وایە لە تەواویتی ئیمان ئەوەیە باوەڕمان بەو حیکمەتانەی خودا بێت کە نایان بینین وەک چۆن باوەڕمان بەو ڕەحمەتەی هەیە کە دەیبینین!"

***

(٢٢٢)

**بۆ ئەوەی زیاتر لە خوداوە نزیک بیت،**
**نەکەی باوەڕت وابێت لە کەسانی تر لێوەی نزیکتریت.....!**

***

(٢٢٣)

ئەگەر شکستت هێنا لە وازهێنان لە ئەنجامدانی تاوان.
واز لە داوای لێخۆشبوون مەهێنە(أستغفرالله)!

***

(٢٢٤)

" دوو شت جێگیرن:
قیبلە، و دڵی دایکت
ئەوەی ماوەتەوە،
بەردەوام و جێگیر نییە و گرەوی لەسەر مەکە!"

***

(٢٢٥)

"پەروەردگارا ڕێگام بدە بە جۆرێک خۆشم بوێیت
کە لەبەردەم سەرپێچی کردنتدا بوەستم،
وەلێ ئەنجامی نەدەم چونکە خۆشەویستییەکەت ڕێگریم لێدەکات.... "

***

(٢٢٦)

" تۆ نازانی لەوەیە پەروەردگارت بە کارسازیی خۆی
کەوتنی بۆ نووسیبێت، بۆ ئەوەی ڕێگایەکی تر بگریتە بەر،
کە تێیدا بەختەوەربوونتی تێدا شاردراوەتەوە.... "

(٢٢٧)

" پەروەردگارا: هەموو پۆزشەکان شایستە نین،

هەموو بەڵگەکان پووچن، بەڵام تۆ ئەهلی لێخۆشبوونیت"

***

(٢٢٨)

ئەسمەعی دەفەرموێت:

گوێم لە کابرایەکی دەشتەکی بوو دەیوت:

پەروەردگارا، ڕێگا چەند تەنگ و ناڕەحەتە

بۆ ئەو کەسەی تۆ ڕێ نیشاندەری نەبیت.....

چەندێ سامناکە بۆ ئەو کەسەی تۆ شادوومانکاری نەبیت....

***

(٢٢٩)

" پەروەردگارا تووشی عەیبەیەکم نەکەیت

کە پێشتر بەهۆیەوە ڕقم لەکەسانێک بووە....!"

(٢٣٠)

" بە ئەندازەی دەسەڵاتی خودا داوا لە خودا بکە،
نەک بە ئەندازەی خەونەکانت.
خاوەنی ئاسمان و زەمین،
هیچ شتێک دەستەوسانی ناکات
داوای مەحاڵی لێبکە...."

***

(٢٣١)

"هیچ کەسێک لە ئێمە ئەو ڕێگایە نازانێت کە ڕۆژە خراپەکانی پێ تێپەڕێنێت... بەڵکوو بە فەزڵی خودا ڕزگارمان دەبێت"

***

(٢٣٢)

" هەموویان گوێبیستی دەنگمن،
پەروەدگارا تەنها تۆ گوێبیستی دڵمیت،
داواکارییەکەی پێ ببەخشە"

***

(٢٣٣)

**ئەوکاتەی ئەو نیعمەتانە دەبژێریت کە پێت نەبەخشراوە،**
**لە بیرت نەچێت ئەو بەڵایانەش بژمێریت کە تووشت نەبووە!**

***

(٢٣٤)

" هەموو دەرگاکان داخرابوون
تا ئەوکاتەی خودا فەرمانی کرد..."

***

(٢٣٥)

تـۆ دەخەویـت ئەو حەزدەکـات هەسـتیت و لەبەردەمیـدا نـوێژ بـکەیت، بـایەکی هێـواش دەنێرێـت و پەنـجەرەکەت دەجوڵێنێـت، یـان منداڵێـک لە خێـزانەکەت لە لای ژوورەکەتـدا ژاوەژاوێـک دەنێـتەوە، یـان زۆر زۆر توونیـت دەبێـت، هەڵدەسـتیت و تەماشـای کـاتژمێر دەکەیـت، دوای چەنـد خولەکێـک لەسـەر بەرماڵییـت و موناجـاتی لەگەڵ دەکەیـت، نازانیـت ئەوە ئەو بوو لە خەوی هەستانیت.

لە کتێبی " چونکە تۆ خودایت"

***

(٢٣٦)

" خەمبار مەبە
ئەگەر ئاواتێکت نەهاتە دی،
لەوەیە ئەگەر پێت ببەخشرایە،
ساتێک دڵخۆشی و سەردەمێک خەفەت بوایە بۆت.
شادوومانی کاتژمێرێک و بەدبەختی تەمەنێک بوایە.

هەربۆیە لە هەموو ئاواتەکانتدا
داوای بژاردەی خودا بکە و بڵێ:
" پەروەردگارا ئەو ئاواتانەم بهێنە دی
کە خێری دین و دنیامی تێدایە!"

(٢٣٧)

بیر لە چۆنیەتیی ڕزگاربوون مەکەرەوە.....
گەر خودا ویستی لە شتێک بوو
هۆکارەکانت بۆ ئاسان دەکات، بەبێ ئەوەی ئاگات لێبێت.

***

(٢٣٨)

گەر تاقی کرایتەوە بە دواخستنی ئەوشتەی ئاواتی پێدەخوازیت.
ئارام بگرە،
بۆ ئەوەی خودا زۆر لەوە زیاتر پێ بدات کە دەتەوێت.

***

(٢٣٩)

خودا دوای دەخات لێت، وەلێ ئەو دڵەت لەیاد ناکات
کە چاوەڕوانی ماندووی کردووە.......

(٢٤٠)

لە دڵی هەمووماندا چیرۆکێک هاوشێوەی چیرۆکەکەی یوسف هەیە:

خەونێکی دوور،

ئاواتێکی زۆر دوورتر،

خەڵکی سوێند دەخۆن کە هەرگیز ئەو شتە بەدی نایەت،

بەڵام دواتر خودا دەیەوێت ئەو کارە ڕووبدات،

هەموو گومانەکان بەتاڵ دەبنەوە.

خودا هەموو ئاواتەکانمان بۆ بەدی هێنێت

زۆر زۆر جوانتر لەوەیە بە خەیاڵماندا هاتبوو

ڕوودەکەیتە ئەوانەی دەیانووت هەرگیز بەدی نایەت، دەڵێیت:

سوێندم بۆ نەدەخواردن کە خودا وەلامم دەداتەوە!؟

سوپاس بۆ خودا کە وەڵامی دوعاکانم لەدەستی ئێوەدا نییە......!

***

(٢٤١)

**خودا ئەو بەندەیەی خۆشدەوێت کە زۆر داوای لێدەکات**

**دایکمان عائیشە دەفەرمووێت:**

**ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوداﷺ دوعای دەکرد،**

**پاشان دوعای دەکرد ..... هەر دوعای دەکرد.**

﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾

لەدوای ئەوەی لە نووسینەوە و وەرگێڕانی ئەم کتێبە تەواوبووم، کتێبەکەم نارد بۆ کتێبخانەیەک بۆ ئەوەی کتێبەکەم بۆ چاپ بکەن و بڵاوی بکەنەوە، بەڵام بەڕێزەوە وەڵامیان دامەوە و وتیان کتێبی تر لە پرۆژەماندایە و لە ئێستا ناتوانین کتێبەکەت بۆ چاپ بکەین، دواتر ناردم بۆ کتێبخانەیەکی تر، بەڵام ئەمان هەر وەڵامیشیان نەدامەوە تەنها تەماشای کتێبەکەیان کرد کە بۆم ناردبوون و هیچی تر، زۆر سوپاسیان دەکەم چونکە وەڵامیان بدایەتەوە کتێبەکە بەوشێوەی ئیمڕۆ خوێنەری نەدەبوو، دوای مانگێک ئەوە بەخەیاڵمدا هات کە کتێبەکە بە **pdf** بڵاوبکەمەوە، بڵاوکردنەوەکەش لە ٩/٢٩دا بێت ڕۆژی لەدایکبوونم، هەم سوپاسگوزارییەک بێت بۆ خودا، هەم دیارییەکیش بێت بۆ خوێنەرانی کتێب و، بەبێ بەرانبەر ئەم کتێبە خنجیلانەیان دەست بکەوێت، متمانەم هەبوو کتێبەکە جێگای ڕەزامەندی خوێنەران دەبێت و، ڕووناکیەک دەبێت بۆ هەموو ئەوانەی بەدڵ لەگەڵی تێکەڵ دەبن، مامۆستا حەیدەر ئیبراهیم هاوکار و پشتیوانی هەمیشەییم ئەرکی پێداچوونەوەی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ، کاکە سەفین بەرگی کتێبەکەی بۆ نەخشاندم، مامۆستا هونەر دیزاینی ناوەوەی کتێبەکەی بۆ کردم، دواتر لە کوردیپیدیا بڵاومکردەوە، پێشوازییەکی زۆر جوانی لێکرا، دوای دوو ڕۆژ لە بڵاوکردنەوەی، دکتۆر بەختیار کەمال تاڵەبانی نامەیەکی بۆ ناردم، ئاماژەی بەوەکرد کتێبەکەتم خوێندۆتەوە و، زۆر ئومێد بەخش و بەسوودە، دەستخۆشی لێکردم و، وتی ڕۆژانە وتەیەکی لە پەیجەکەمدا دادەنێم، الحمدلله ماوەی چوار مانگە دەیان وتەی کتێبەی بڵاوکردۆتەوە و، دەیان هەزار خوێنەری هەبووە و

مایەی ڕەزامەندیان بووە، دواتر کتێبەکەم بۆ مامۆستا هونەر نارد و، دەستی نەنا بەڕوومەوە و بەڵێنیدا بۆم چاپ بکات، الحمدلله ماوەی دوو مانگ کەمتر لەبازاڕدا بووە، دوو چاپی کتێبەکە تەواوبووە و، نزیکەی پانزە هەزار جاریش داونلۆد کراوە، ڕۆژانەش خوشک و برایان پەیام دەنێرن کە چەندین جار کتێبەکەیان خوێندۆتەوە و لە بێ هیوایی و بێ ئومێدی ڕزگاری کردون و، بۆ هەموو کاروبارێکیان سەرەتا دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، لەکۆتاییشدا دەڵێن بەڕاستی ئەم کتێبە بۆ ئێمە نووسراوە، داواکارم لە خودا ئەمکارەمان لێ قبوڵ بفەرموێت و بەرەکەتداری بکات.....

## سوپاسنامە

➢ سوپاس بۆ باوک و دایکی ئازیزم کە بەردەوام دوعای خێرم بۆ دەکەن کە کارەکانم باربێت، سەرکەوتوبێت، ئەوەی ئیمڕۆ ئەم کتێبە پێی گەیشتوە بێ گومان بەرەکەتی دوعای ئەوانە...

➢ سوپاس بۆ دکتۆر بەختیار کەمال تاڵەبانی، کە متمانەی بە کتێبەکەم کرد و، بەردەوام وتەکانی بڵاودەکاتەوە.....

➢ سوپاس بۆ مامۆستا حەیدەر کە پێداچوونەوەی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ.

➢ سوپاس بۆ کاک هونەر و ناوەندی سارا کە کتێبەکەیان قبوڵ کرد و بڵاویان کردەوە.

➢ سوپاس بۆ ئەو پەیجانەی کە ڕۆژانە بابەتەکانی ئەم کتێبە بڵاودەکەنەوە، بەتایبەتی پەیجی ماڵی عاریفان و توێشوی قیامەت و شنەی ئیمان.....

➢ سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە.

➢ سوپاس بۆ خێزانم کە لە پێداچوونەوەم بۆ چاپی سێیەم هاوکارم بوو....

ئاگای لێتە لەم دەرگا دەدەیت، دەڕۆیت بۆ ئەو دەرگا.
سەرناکەویت، ماندوویت، خەمباریت.
ئەم سەرکۆنەت دەکات، ئەو بێزارت دەکات.
تۆش خەمبار دەبیت، دەگریت، دەکەویت، هەڵدەسیتەوە
دواتر هیچ پەناگەیەک شک نابەیت پەنای ئەو نەبێت.
بە شەرمەزارییەوە، بە گریانەوە، بە پەشیمانییەوە
دەچیتەوە بەر دەرگاکەی.
ئەویش پیشوازیت لێدەکات، وەک ئەوەی بفەرمویت:
گەر لەگەڵت سارد بوون، ئەوا منت هەیە!
گەر ئازاریان دایت، من دکتۆری تۆم!
بەخێرهاتیتەوە، بەخێرهاتیتەوە،
بەخێرهاتیتەوە بۆلام بەندەکەم.
بۆ سکاڵا دەبەیتە لای کەسانی تر
کە هەر من نارەحەتیت لەسەر لادەبەم
بەندەکەم بانگم بکە......وەڵامت دەدەمەوە
**من لەبارەی خوداوە بۆتان دەدوێم......**






3500




ناوەندی سارا
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە